


# خۆشەویستی خۆشەویستان

## پێغەمبەرمان لە روانگەی قورئانی پیرۆزدا

دکتۆر بکر سید غریب بەرزنجی

# خۆشەویستی خۆشەویستان

## پێغەمبەرمان
## لەروانگەی قورئانی پیرۆزدا

نووسینی:
دکتۆر بکر سید غریب بەرزنجی

---

هەولێر- کوردستان چاپی دووەم ١٤٣٣هـ – ٢٠١٢م- ٢٧١٢ك

**لەبڵاوكراوەكانی مەكتەبی تەنفیزی**

**یەكێتی زانایانی ئاینی ئیسلامی كوردستان**

**زنجیرە ( ٢٠ )**

پڕ بەدڵ سوپاسیو پێزانینی خۆم ئاراستەی مەكتەبی تەنفیزی یەكێتی زانایانی ئاینی ئیسلامی كوردستان دەكەم بەتایبەتی بەڕێز مەلا عبدالله مەلا سەعید گرتكی سەرۆكی یەكێتی زانایانی ئاینی كە ئەركی بەچاپ گەیاندنی ئەم نووسینەیان خستە ئەستۆی خۆیان... هیوادارم هەر پایەدارو تەمەن درێژ بێ.

**دكتۆر بكر سید غریب بەرزنجی**

* خۆشەویستی خۆشەویستان

پێغەمبەرمان لە روانگەی قورئانی پیرۆزدا

نووسینی: دكتۆر بكر سید غریب بەرزنجی

* بەرگو دیزاین: كۆمپیوتەری دەریا

* نۆرەی چاپ: دووەم ٢٠١٢

* چاپی یەكەم ٢٧٠٧كو/ ١٤٢٨ك/ ٢٠٠٧ز

* تیراژ: ١٠٠٠ دانە

* چاپ: چاپخانەی ماردین



(( وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ لَمَا آتَيْتُكُمْ مِنْ كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مُصَدِّقٌ لِمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنْصُرُنَّهُ قَالَ أَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَى ذَلِكُمْ إِصْرِي قَالُوا أَقْرَرْنَا قَالَ فَاشْهَدُوا وَأَنَا مَعَكُمْ مِنَ الشَّاهِدِينَ (٨١) فَمَنْ تَوَلَّى بَعْدَ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ(٨٢) أَفَغَيْرَ دِينِ اللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ))[١]

**بە ذكر و فيكرى شيمەی موصطەفا وەقتت موصەففا كە**
**كە باسی ئەو صەفا بەخشە، طە رەب خێزە، دور ئەفشانە[٢]**

**خۆشەویستی هەموومانە محمد**
**رابەری هەردوو ژیانە محمد**
**هەموو بلێن: هەزارەها صەلات**
**لە محمد، لە یارانی هەموو كات[٣]**

---

1- ال عمران: ٨١-٨٣.

2- بروانە: ديوانی محوی (قصيدەی نور): ٤٢٦.

3- نامەيەكی كراوە، سيد بكر بەرزنجی، ١٤٢٧ك، دەست نووس.

**پێشکەشە بەو خوشك و برایەم ئەگەر ڕاست بووم دوعای چاکەم بۆ دەکات، ئەگەر هەڵەش بووم ئاگادارم دەکاتەوە لە هەڵەکانم.**

**پێشکەشە بە گیانی پاکی باوکم (سید غریبی سێتاقان غەزایی بەرزنجی) کە یەکەم کەس بوو فێری کردم کە ئایینی ئیسلام تەواو کەری ژیانە!**

# پێشەکی دووەم

بسم الله الرحمن الرحیم

## بەناوی خوای گەورە و میهرەبان

سوپاس بۆ خوای گەورە بێت، دروودی خوای گەورە لەسەر گیانی پاکی پێغەمبەرمان و پێغەمبەران بێت و خوای گەورە لەیارو شوێنکەوتوانی پێغەمبەرمان (ﷺ) ببورێت و پاداشتیان بە بەهەشتی بەرین بداتەوە.

سوپاس بۆ خوای گەورە کە توانیمان چاپی دووەم بڵاو بکەینەوە.

بەڕاستی هەردەم چاپی دووەم لەلایەن نووسەر گرنگییەکی تەواوی هەیە لە چەند لایەنەوە، وەکو چارەسەری ئەو هەڵەو لەبیرچوانەی کە لەچاپی رابردوو روویدابوو، وە سوود وەرگرتن لەو تێبینیی و سەرنجانەی کە بۆی رەوانە دەکرێت دوای بڵاو بوونەوەی نووسینەکە، بۆیە چاپی دووەم لەلایەنی خودی نووسەر بەلای منەوە زۆر جیایە لەچاپی دووەم لەدوای ئەو بکرێت جا هەر چ نووسەرێك بیکات!

ئەوەی پێویستە لەم گۆشەیە پێتانی رابگەینم، نەمویست لەم چاپەدا بابەتی تر پتر بکەم بۆ ئەم چاپە بەڵکو نووسینەکانم وەکو خۆی رێکخست و تەنیا چەند گۆڕانکاری هونەری و زمانەوانیم کردو چەند لایەنی راڤەم دەسکاری کرد، تا نووسینێکی تر خوای گەورە یاریدەدەرمان بێت و هەموو کاتمان خزمەتی ئەم ئایینە پاکە بێت.

**دکتۆر سید بکر بەرزنجی**

**١٤٢٣ك**

**هەولێر / مزگەوتی اعجاز**

# پێشەکی یەکەم

## بەناوی خوای گەورە و میهرەبان

سوپاس بۆ خوای گەورە بێت

دروودی خوا لەسەر گیانی پێغەمبەرمانو گشت پێغەمبەران بێت.

خوای گەورە لە یارو شوێنکەوتووانی پێغەمبەرمانو گشت پێغەمبەران(ﷺ) ببوورێتو پاداشتیان بە بەهەشت بداتەوە.

داواکارین کە خوای گەورە یارمەتیمان بدات، تاوەکو هەموو پیتو وشەیەکمان

هەموو تواناو خەباتێکمان

هەموو بزاڤ و وەستانێکمان

هەموو رەفتارو گوفتارێکمان

هەموو بۆچوونو هەڵوێستێکمان

هەموو پێکگەیینو دابرینێکمان

لەپێناوی رەزامەندی خوای گەورە بێت.

(إن شاء الله) رەزامەندی خوای گەورە تاکە سەرمایەی هەردوو ژیانمانە.

داواکارین ئەی خوای گەورە وەڵاممان بدەوە، وەڵاممان بدەوە، وەڵاممان بدەوە.

خوشكو براكانم.. ئەی هاوبیرو هاوسەنگەرانم

ئەی ئەوانەی شەو دەخەنە سەر رۆژ لەپێناوی بڵاوکردنەوەو راگەیاندنی ئەم ئایینە پیرۆزە.

ئەی ئەوانەی گەیینە ئەم ئاستە کە بتوانن دیواری نەزانین لابدەن و بگەنە ئەم راستییە کە تەنیا ئایینی ئیسلامە ئادەمیزاد دەگەیێنێتە باوەشی کامەرانی و شادی لە هەردوو ژیان!

ئەی ئەوانەی بالۆرەی بێباوەڕان نەیانتوانی سڵتان بکاتەوەو لەراستە رێگای ژیان لاتان بدات.

ئەی ئەوانەی زانستو ژیریتان کردۆتە زەمینەی گشت بزاڤێکتان.

سوپاس بۆ خوای گەورە جارێکی تریش پێکگەیشتینەوە.

سوپاس بۆ خوای گەورە جارێکی تریش لەپێناوی خزمەتی ئەم ئایینە پیرۆزەو ئەم گەلە پارچە پارچە کراوەو رەنجدەرە پێکگەیشتینەوە.

داواکارم کە خوای گەورە (ان شاء الله) بۆ کاری چاکو وتەی چاک، بەهێزو سەرکەوتوومان بکات، سەقامگیرو بەردەوامان بکات. دامەزراوو هەستیارمان بکات، خاوەن هەڵوێستو نەترسمان بکات، چونکە خزمەتی گەلێکی موسڵمانی چەوساوەو پارچەکراوی وەکو گەلی کوردی موسڵمان بەتایبەتیو وەکو گەلانی موسڵمانان بەگشتی، لەپەیامی ئایینە پیرۆزەکەمان، بەناوەندی خواپەرستی دەژمێردرێتو خوای گەورەش مژدەو پەیمانی هاوکاریو پشگیری ئەم خەباتەی داوە:

(وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ الْمُؤْمِنِينَ)[1]

زانایان دەفەرموون، ناوەرۆکی ئایین زانیینە بە سێ خاڵ:

یەکەم: زانستت هەبێت لەبارەی خوای گەورە.

---

1- الروم: ٤٧.

دووەم: زانستت هەبێت لەبارەی پێغەمبەرمان(ﷺ).

سێیەم: زانستت هەبێت لەبارەی ئایینەکەت.

ئەم سێ خالە سەرچەمسەرە ئایینی اسلامە.

لەژێر رۆشنایی ئەم کلاورۆژنانەدا بڕیارمدا لەم پێك گەینەدا بەیەکەوە لەگەڵ پێغەمبەرمان بمینێینەوە(ﷺ).

دیارخستنی خۆشەویستی محمدو پلەی خۆشەویستی محمد(ﷺ) دیاردە نییەو بەس بەڵکو بنەماو راستییەکە هەر هەموومان دەبێت لەنزیکەوە هەستی پێبکەینو لەنزیکەوەش ریزی لێبنێینو بەتوندی بیگرین ئەگەر هەست بەویستو ئاواتی گەلەکەمان دەکەین!

((لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلاً))[1].

ئەم نامیلکەیەم ناو نا خۆشەویستی(ﷺ) ئەو خۆشەویستانەم کە خزمەتی گەلو خاکەکەم دەکەنو هەردەم بە پەیامی خوای گەورە دەژین.

چەند جار دووبارەو دەبارەم کردۆتەوە لە ٤٠ ساڵی رابردوو لەوتارو نووسینەکانم، ئەگەر هەر کەسێك دژی ئایینی ئیسلام بوو ئەوە دژی بەرژەوەندی گەلەکەیەتی بەگشتیو دژی بەرژەوەندی خۆیەتی بەتایبەتی! (ﷻ).

وە بەپێچەوانەشەوە بەپێچەوانەوەیە، هەر کەسێکت دیت هەرچەند خۆی وا بنوێنێت (وەکو دەڵێن هەر چ شێوە –باك گراوند–ی بۆ خۆی رازاندبێتەوە چ بە گوفتار یا بەشێوە) گوایە دڵسۆزو پێشمەرگەی گەلەکەیەتیو گوایە پاسەوانی خالە

---

1- الفتح: ٩.

گەرمەکانە، ئەگەر دژی ئایینی ئیسلام بوو و دوور بوو لە پەیامی خوای گەورەو پێغەمبەرمان(ﷺ) ئەوە بەبێ دوو دڵی دژی بەرژەوەندی گەلەکەیەتیو هەردەم دوورە لەسوودی خۆی.

بۆیە لەم گۆشەیەدا بۆ ئەوەی کە جێی پەنجەی خۆمان بکەینەوە لەخزمەتی گەلی کوردی پارچە پارچە کراو خزمەتی جیهانی خواناسانی تاوان لێکراوو گەمارۆدراو بە پلانو پیلانی بێباوەڕان، ئەم نامیلکەیە دەکەمە دیاری بۆ ئەوەی منیش وەکو برا خاوەن باوەڕەکانم بتوانم خزمەتی ئەم پێغەمبەرە(ﷺ) بکەم، بەو نیازەی کە خزمەتی پێغەمبەرمانو ئایینو خزمەتی گەلەکەمانەو خوای گەورەش (ان شاء الله) هاوکاریمان دەکات بۆ ئەم کارە دیاری کراوە.

((إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الأَشْهَادُ (٥١) يَوْمَ لاَ يَنفَعُ الظَّالِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ وَلَهُمُ اللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوءُ الدَّارِ))[1].

**دکتۆر سید بکر بەرزنجی**
**هەولێر مزگەوتی اعجاز**
**١٤٣٢ز**

---

1- غافر: ٥١-٥٢.

# تابلۆی یەکەم

# مەبەست لە خواپەرستن

خزمەتی گەل‌و خاك ئەگەر بەوردی شیبکرێتەوە ئەوە لەدوو خاڵ خۆی دەبینێتەوە،

یەکەم: ریزگرتنی ئەو ویستە پاکانەی کە گەل دەیەوێت.

دووەم: رێنمایی کردنی گەل بۆ ویستی پاکترو هیوای گەشترو ئاسۆی فراوانتر.

ئیتر هەر هەموو ئاواتمان لەم چوارچێوەیەدا خۆیان خردەکەنەوە، ویستی پاکی گەل‌و هاندانی گەل بۆ رێبازی رێکی ژیان.

بۆیە پێویستە کە هەموو توانایەکی بەرجەستەو نابەرجەستە وەکو (جوولان‌و داهێنان‌و بەرهەم‌و سەربازی‌و کارگێڕی‌و دادو خوێندن‌و...) لەم دوو خاڵەدا خۆیان ببێننەوە.

ئەگەر بەوردی‌و قووڵی سەیری ناوەڕۆکی ئایینی ئیسلام بکەین دەبینین، هاتنی هەر هەموو ئایینەکانی ئاسمانیش تەنیا بۆ راپەراندنی ئەو دوو خاڵە هاتوون، کە کامەرانی لە دڵی ئادەمیزاددا دروست بکەن‌و پەژارەو گەندەڵی‌و قەیرانی رێبازی ژیانی لابدەن، وەهەروەها ئایینی ئیسلام روونی کردۆتەوە کە شادی ئادەمیزاد مەبەستە (الغایـة)و بەس، ئیتر هەر هەموو شێوەکانی خواپەرستی هۆکارە (الوسیلة) بۆ گەیین بەم ئاواتەی کە شادی ئادەمیزادە.

* * * * *

ئا ئەم هەموو ویستو هیوایە لەئایینمان ناونراوە بە (العبادة) واتە بەندایەتی ئەو خوایە گەورەیەی کە ئەم بڕیارەی داوە وە راپەراندنی ئەم بڕیارەش لەچوارچێوەی لەخواترسان (التقوا) دارێژراوە، ئەو کەسانەی خاوەنی ئەم هەڵوێستەن ئەوە ئاشتیخوازان (المسلمون کە لەوشەی السلام وەرگیراوە) وەهەروەها خاوەن باوەڕین، کە بنچینەی باوەڕی واتە ئاسییش پارێزان (الایمان لە وشەی الامن وەرگیراوە)، واتە ئەو ئادەمیزادە کراوە:

((إِنَّ اللّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ))(١)

بۆ ئەوەی ئەم کارانە بکات، ئا ئەوە کارەکانیەتی، وردی ئایینمان لەوەدایە کە ئەم هەموو ویستو هیوایە بە خواپەرستی (العبادة) دادەنێت ئەگەر پارێزەری ئەو ویست و هیوایانە بێت (التقوا) کە بە بەرژەوەندی گەل کۆتایی دێت (المعروف یا الصالحات)، خۆ ئەگەر بەرهەڵستی ئەو ویستو هیوایانە بکات کە بەپێچەوانەی بەرژەوەندی گەلەکەیەتی ئەوە بە (المنکر یا السیئات) دەزانێت.

وەکو بەڵگە نەویستە کە هەردەم ئایینمان تاکە هێزێکی (الصمام الامان) بۆ پاراستنو داهێنانو رێکخستنی سوودی ئادەمیزاد!

((وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً))(٢).

بەڵکو بوونەوە بە هەموو پێکهاتەکانیەوە بۆ بەرژەوەندیو خۆشی ئادەمیزاد دروست کراوە:

---

1- التوبة: ١١١.

2- الاسراء: ٧٠.

((اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَأَنزَلَ مِنْ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنْ الثَّمَرَاتِ رِزْقًا لَكُمْ وَسَخَّرَ لَكُمْ الْفُلْكَ لِتَجْرِيَ فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ وَسَخَّرَ لَكُمْ الأَنهَارَ (٣٢) وَسَخَّرَ لَكُمْ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ دَائِبَيْنِ وَسَخَّرَ لَكُمْ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ (٣٣) وَآتَاكُمْ مِنْ كُلِّ مَا سَالْتُمُوهُ وَإِنْ تَعُدُّوا نِعْمَةَ اللَّهِ لاَ تُحْصُوهَا إِنَّ الإِنسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ))[١].

هەر بۆیەش هیچ ئادەمیزاد نەماوە لەم بەزەیی‌و چاکە دوورخرابێتەوە:

((وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ))[٢].

واتە: خوای گەورە دەفەرمووێت: (بەزەیی من‌و چاکە من‌و رۆزی من، هەرهەموو شتێکی گرتۆتەوە چ گیان لەبەر بێت چ بێ گیان ئەوە کەوتۆتە ژێر چاکەکانم).

وەهەروەها هیچ ئادەمیزادێك نییە کە لەناوەرۆکی ژیان ئاگادار نەکرابێتەوە کە خواپەرستی‌و راپەراندنی یاسای خوای گەورەیە:

((إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ بِالْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَإِنْ مِنْ أُمَّةٍ إِلاَّ خلاَ فِيهَا نَذِيرٌ))[٣].

خواپەرستیش واتە دابین کردنی بەرژەوەندی ئادەمیزادو دوور کەوتنەوە لەو شتانەی کە قەیران‌و گیروگرفت‌و زیانی (الضرر) پێدەگەینن.

((وَمَا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ إِلاَّ لِتُبَيِّنَ لَهُمْ الَّذِي اخْتَلَفُوا فِيهِ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ))[٤].

---

1- ابراهيم: ٣٢-٣٤.

2- الاعراف: ١٥٦.

3- الفاطر: ٢٤.

4- النحل: ٦٤.

لەم کلاو رۆژنانەدا ئەوەی گرنگو مەبەستە نەتەوەکەم، نەتەوەی کورد، کە بەر لە ١٤٠٠ ساڵ بەویستو ئارەزووی خۆیو بەدڵسۆزیەکی بێ سنوور لە ٩٥٪ی ئایینی ئیسلامی کردۆتە رێبازی ژیان (الشریعة)و محمدی داناوە بەخۆشەویستی(ﷺ) خۆی!

ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ بوونی بابەتێکی پڕ لەزانستی ژیری لەئاییینماندا وەهەروەها بیری کراوەی نەتەوەی کورد.

((أَفَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُمْ مِنَ الْقُرُونِ يَمْشُونَ فِي مَسَاكِنِهِمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِأُولِي النُّهَى))[1].

(( يُؤْتِي الْحِكْمَةَ مَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلاَّ أُوْلُوا الأَلْبَابِ))[2].

دیمانێکی بەڵگە نەویست لەسەر ژیریو گەیینی بیری کورد، من وەکو لەناوچەکانی شاری (هەولێر) ژیاوم کەمێك شارەزامە لەوشە رۆنانی ئەم ناوچەیە، خەڵکی ئەو ناوچەیە لە ٧٠٪ یان کاتێ بیانەوێت ناوی محمد یا پێغەمبەریان(ﷺ) بفەرموون، ئەوە زۆر جار بەشێوەی خۆشەویست یا خۆشەویستمان دەفەرموون، ئەم وشەیە لەلایانەوە ناسك ترینو خۆش ترینو شیرین ترینو پڕ واتا ترینو دلگیرترین وشەیە.

کاتێ کە فەرموویان: خۆشەویستمان(ﷺ) فەرموویەتی، ئەوە هەموو تواناو بۆچوونو رێنماییەك دەوەستێتو لەکار دەکەوێت تەنیا تواناى خۆشەویستە

---

1- طه: ١٢٨.

2- البقرة: ٢٦٩.

راستەقینە بیٚ گەردو بیٚ رتوش‌و بیٚ بۆیەکەیە کە دێتە پێش‌و ماوەی دراوە کە بیر رووناك بکاتەوەو تاکە رێنمایی کارە لە هەردوو ژیانە.

(( قُـلْ إِنْ كَـانَ آبَـاؤُكُمْ وَأَبْنَـاؤُكُمْ وَإِخْـوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُـمْ وَعَـشِيرَتُكُمْ وَأَمْـوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُمْ مِنْ اللَّـهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ))[1].

* * * * *

وە پێم خۆشە بیزانین، ئەگەر وشەی (خۆشەویست) لە هیچ رستەو برگەیەك واتای تەواوو رێك نەبەخشێت، ئەگەر وشەی خۆشەویست لە هیچ گەرو لێوو وتەیەکدا دەنگ داناوەو رەنگ داناوەو سۆزی خۆی پەخشان نەکات، ئەگەر وشەی خۆشەویستی لە هیچ هۆنراوەو گۆرانییەك واتای تەواو نەبەخشێت، ئەگەر وشەی خۆشەویست لە هیچ شوێنێك نەتوانێت ئەو واتایە ببەخشێت کە خۆشەویستییە پڕ بەواتای وشەکە، ئەوە لەناو رستەی محمدی خۆشەویست(ﷺ) توانیویەتی هەرهەموو جۆش‌و سۆزو واتاو بەهایەك دروست بکات لەدڵی موسڵمانانداو یەك بە پێستی وشەکە خۆشەویستی بنوێنێت. (ﷻ)

* * * * *

هەر بۆیە وەکو هەموو گەلانی خواناس، گەلەکەی منیش، سەدان زاناو هۆنەری وەکو (جزیری‌و خانی‌و محوی‌و صافی‌و صابری‌و مولوی‌و نۆدەیی‌و بێخودو پاکی‌و...)(رحمهم الله) وا دەیانەوێت باسی تروسکاییەك لەم خۆشەویستییە بکەن.

---

1- التوبة: ٢٤.

ئەو خۆشەویستییەی کە لەنێوان ئەم چەند پیتەدا خۆی نواندووە ماتەوزەیەکی هەیە، تواناو هێزێکی لەخۆیدا گرتووە، دەریایەکی بێ سنووری سۆزە، کانیاوێکی بێ بنی پر لەواتایە، ئەو خۆشەویستییە توانایەکی داهێنەرو چاکی لەبیردا پێگەیاندوە، کە بەسە بۆ ئەو توانایەی خۆشەویستی پێغەمبەرمان(ﷺ) کە بلێم نەتەوەی کوردو نەتەوەکانی تری جیهانی خواناسان ١٤٠٠ ساڵە نەیانتوانیوە لەم کانیاوە تێر ببن و لەم کانیاوە بێزار ببن.

* * * * *

شێخ (نجم الدين صابری بەرزنجی)(رحمه الله) (١٨٨١ز–١٩٤٤ز) شێخی زاناو هۆنەری داهێنەری شاری کەرکوک دەفەرمووێت:

**عالەمی کردە جسد نوری حبیبی کردە روح**
**بۆیە وا هەر ماوە ناخنکێ بەسەد تۆفانی نوح**

**خوا بە قورئانی موبینی افضالی ئەو ئەکا اثبات**
**کافیە شق القمر، میعراج و باقی موعجزات[1]**

* * * * *

(ملا بێخود)ی (رحمه الله) خواناس سەیرکە چۆن دڵەکەی فریوە بۆ شاری (مدینەی رەنگین)و بەدوای دا دەگەرێت:

---

1- دیوانی: صابری، چ: ١: ٣٢.

**ئاخۆ بە چ شاخێکەوە گیرساوە دلی من**
**یاخۆ بە چ داخێکەوە سووتاوە دلی من**

وادیارە بێ ئاواتە لەم بز بوونەی دلی بۆیە دەفەرموێت

**لەو یوسفە پرسیومە لە بێگانە و یاران**
**هەرگیز نییە سۆراخی لە هیچ لاوە دلی من**

وە لەکۆتایی هۆنراوەکەیدا دەفەرموێت

**مەعلوم چووە بۆ خزمەتی سالاری مەدینە**
**وام زانی کە فەوتاوە نەفەوتاوە دلی من[1].**

* * * * *

سەیری ئەم هۆنەرەش بکە چۆن هەرهەموو دەرگای بەروو داخراوەو رووی کردۆتە خۆشەویستەکەی(ﷺ):

**سەد حەکیم هات و عیلاجی ئەو برینانەی نەکرد**
**تۆ عیلاجی دەردەکەم کە زوو بە لوقمانم وەرە**

* * * * *

1- دیوانی: بێخود، بغداد، چ: ١، چا: سلمان الاعظمي: ٦٦-٦٨.

هۆنەری کورد (احمد شوقی)(ﷺ) کە لەبنەماڵەکانی کوردی تورکیایەو لە مصر ژیاوەو بووە بە (امیر الشعراء)ی (عرب) دەفەرمووێت:

**اخوك عيسى دعا ميتا فقام له**

**وانت احييت اجيالا من العدم**[1]

* * * * *

بۆیە کاتێ کوردی هەستیار باسی خۆشەویستەکەی دەکات کە محمدی پێشەوایە(ﷺ)، دڵنیابە کە باسی نیشتمان پەروەری دەکات، ئەوە باسی خەباتو تێکۆشان دەکات، ئەوە باسی داهێنانو پێشکەوتن دەکات، خۆشەویستی محمد بوو کە دڵەکانی جۆشدا بۆ جوولەو جوولەکانی خستە کارو کارەکانی لەچوارچێوەی دادو یەکسانیو زانستیدا گرد کردەوە.

دڵنیابە کاتێ کورد لە ۹۵٪ی (سوپاس بۆ خوای تاکو بەتوانا) شوێنکەوتووی محمدی خۆشەویستە، ئەگەر کورد لە ۵۰٪ شوێنکەوتووی (دارو بەردو گاو ئاگرو...) پەرستن بوایە، ئەوە بێباوانی (عَلماني)، ئەوە نەزانەکانی خۆفرۆشی رۆژهەڵاتو رۆژئاوا، ئەوە نەزانانی بەویستو ئاواتو خەباتی کورد، سەدان نووسینو سروودو هۆنراوەیان بەسەر (ریخی گاو تەنی سوتانو ژیلەمۆو ئاگرو تاشەبەرد وشکو رەنگی بەرد) دادەنا، چونکە لە ۵۰٪ کورد هەڵیبژاردووەو کردوویە بەخوای خۆی! (خۆمان بەخوای گەورە دەپارێزین، نعوذ بالله)، بەڵام لەکاتێکدا کە گەلی کورد بە هەموو تواناو سۆزو ژیریەوە، محمدی(ﷺ) کردۆتە

---

1- دیوانی احمد شوقي، مصر.

پێشەواو خۆشەویست ئەوە بە (دواکەوتن)و (کۆنەپەرست)و (تاوانکارو تاوانبار)ی دەزانن!؟ (ﷻ)

خوای گەورە پاداشتی چاکەی (شرف الدین محمد البصیری) بداتەوە کە دەفەرمووێت:

**وكيف يدرك في الدنيا حقيقته**

**قوم نيام تسلوا عنه بالحلم**[١]

واتە: (چۆن دەزانێت ئەم دنیایە چۆنە، گەلێك كە نووستووەو وا لە پرخەی خەوەو خەون دەبینێت)!

یا دەفەرمووێت:

**قد تنكر العين ضوء الشمس من رمد**

**وينكر الفم طعم الماء من سقم**[٢]

واتە: (لەبەر کوێری خۆی خۆی رووناکی خۆری بەلاوە نییە، تامی ئاو ناکا چونکە دەردەدارە).

* * * * *

ئەوەش بەشێکە لەبەشەکانی پلانو پیلانی رۆژهەلاتو رۆژئاوایی کە کاردانەوەی لەسەر سەرخانی چەند فەریکە خوێندەوارێكو چەند پێنووس بابرووەدوێکی چەقی چەند رۆژنامەیەك كردووە.

1- دلائل الخيرات– البردة المديح–، شرف الدين محمد البصيري، ط: ١، بغداد، مط: الوسام، ١٩٨٢ز: ٢٤٣.

2- هەمان سەرچاوە: ٢٥٣.

خۆ تۆ ناتوانی زۆر بەچاکی نزیك ببیەوە لەچۆنیەتی نەزانینو بێ ئاگایی ئەم مشەخۆرانە تاوەکو بەراوورد نەکەی لەنێوان ویستو بنەمای پەیامی محمدی خۆشەویست(ﷺ)و ویستو بنەمای ئەو هەموو دێوەزلو درندانەی کە کردوویانە بە خواو پێشەواو سەرداریان؟!

((وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ))[1].

بابێین لەجیهانی بەراورددا خۆشەویستمان بناسین(ﷺ)، با لەجیهانی خزمەتی رۆڵی نەتەوایەتیو خەباتی گەلی کورددا لەم ١٤٠٠ ساڵە خۆشەویستمان بناسینو بەراوردی بەرهەمی ئەو هەموو مزگەوتانەی کوردستان بکەین لەماوەی ١٤٠٠ ساڵەدا کە چۆن بنکەو پێگەو چەقی دادو رۆشنبیریو هاوکاری بووەو پێشەواکانی خوێن رشتنو دزیو ئابروو بردنیش کە مێژوو لە من باشتریان شارەزایانەو دەیانناسێت!؟

* * * * *

---

1- ال عمران: ٦٤.

# کوردو ئایینی ئیسلام

پێی بڵێ هەلسە کاتی هەڵمەتە
موسڵمان کۆتی ژێردەستی شکاند

ئای کە نابینیٚ شەمشەمە کوێرە
ئیسلام چۆن کوردی بەجیهان ناساند

تاکە رێبازی خەباتە شۆڕش
سەدان زۆردارو نۆکەری تۆقاند

نرکەی موسڵمان لە شارو لە دێ
کوفری لەدەریای نەماندا خنکاند

سەربەرزم هەردەم بە مزگەوتەکان
هەزاران وەچەی ژێری پێگەیاند

کوردی من ئیمرۆ لەسایەی ئیسلام
هێزی ( دڵ شێر ) و ( عەفلەقی ) رماند[1]

1- دل شێر: پاڵەوانی خاچ پەرستی بەزیوو بوو، (میشیل عفلق) دامەزرێنەری (حزب البعث العربي الاشتراكي) بوو.

لەژێر سێبەری مزگەوت و میحراب
بەرەی زانستو وشەی پێگەیاند

زۆرچاك بزانە بازووی خواناس بوو
لە کوردستاندا کە ئالای چەقاند[٢]

قاضيو پیران و حفید و بارزان
بیری هەڵمەتیان لەم خاکە ڕواند
ایوبی، رەزا، نەورەس و سمکۆ
قەلای ستەمیان لەڕەگا هەژاند
بوون بە ڕابەر و بە ئاسۆی هیوا
کوردیان لە باوەش برایەتی نواند[١]

* * * * *

بۆچی ئەم درندانەی جیهان بەگشتی دژایەتی محمدی خۆشەویستمان (ﷺ) نەکەن؟!

بۆ هەموو توانایان نەخە گر بۆ توانەوەی سەرچاوەکانی خۆشەویستی محمد لەکوردستان!؟

من لەنزیکەوە ئاگادارم پتر لە ٤٠ ساڵە (یەکەم پەرتووکم لەساڵی ١٣٩٧ك بەناونیشانی -جیهانێکی وون- بڵاوکردەوە وە یەکەم کۆرم لەبارەی -چەند

---

1- ترکەی هۆنراوە، سید بکر بەرزنجی، هەولێر

رووەكانی ماتماتیك لەقورئانی پـیرۆزدا– لەسـاڵی ١٣٩٧ك لـەهۆلی لاوان پێشكەش كرد)، چونكە ئەم بێباوەڕانە خەریكی دزینی دارایی‌و سامانی ئەم گەلـەن، چـونكە ئەم بێباوەڕانە خـەریكی ئارەزوو بازیو ئابرو بردنـی ئافرەتـانی ئـەم كۆمەڵگایـەن، چـونكە ئـەم بێباوەڕانـە تـەنیا لەگۆمـە لیلـەكان دەتـوانن مەلـەی ژیانیـان بكـەن‌و لـەگۆمی لیلـدا دەتـوانن جیهـانی فێـل‌و لـە خـشتە بـردن‌و داگیركـردن‌و تۆقانـدن‌و توانـــەوەی نامـــەی كـــچ‌و كـــوڕ ئـــاوەژوو بكـــەن، بـــەڵام پـــەیامی محمـــدی خۆشەویست(ﷺ)و پێشەوای ژیران:

((اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُمْ مِنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ أُولَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ))[١].

واتـــەی بـــەكورتی: (خـــوای گەورەیـــە كـــە پێـــشەوای خواناســـانە هـــەردەم لەتاریكاییەكانی ژیاندا دەریان دێنێت بـەرەو رووناكی درەوشـاوەی ئیسلام بـەڵام ئەوانەی كە بێباوەڕن پێشەواكەیان زۆردارانن كە هەردەم خەڵك لە رێبازی رووناكی ژیان لادەدەن‌و بەرەو تاریكییەكانی ژیانی دەیانبـەن، ئەوانـە یـارانی ئـاگرن‌و هـەر لەئاگری دۆزەخدا دەمێننەوە).

وەكو پێشەوا و خۆشەویستی خۆشەویستان لە بارەی پێناسـەی ئـەم ئایینـە دەفەرموویـت: (لیلها كنهارها)[٢].

واتە: ئەم ئایینە پاكە شەوەكانی وەكو رۆژ روون‌و ئاشكرایە !

1– البقرة: ٢٥٧.

2– رواه احمد و ابن ماجة وحاكم وبيهقي، بروانە: جامع الصغير، ابو بكر عبدالرحمن السيوطي.

واتە: سوودی ئەم ئایینە بۆ ئادەمیزاد هێندە بەکەلکە، ئەوەی نادیاریشە ئەوە وەکو وەك دیارەکان دەدرەوشێتەوە.

ئەم ئایینە ئەو رێبازەیە کە لەپێناوی پاراستنی سەرو ماڵو ئابروی ئادەمیزاد هاتووە:

((قُلْ تَعَالَوْا أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلاَّ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَلاَ تَقْتُلُوا أَوْلاَدَكُمْ مِنْ إِمْلاَقٍ نَحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ وَلاَ تَقْرَبُوا الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَلاَ تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ (١٥١) وَلاَ تَقْرَبُوا مَالَ الْيَتِيمِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّى يَبْلُغَ أَشُدَّهُ وَأَوْفُوا الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ لاَ نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى وَبِعَهْدِ اللَّهِ أَوْفُوا ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ (١٥٢) وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلاَ تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ))[١].

* * * * *

محمد پەیامی هاوکاری و تەبایی و ناوبژی و یەکسانی و دادی پێیە:

((وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلاَ تَعَاوَنُوا عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ))[٢].

پەیامی ریز گرتنو پێزانینی توانای ئافرەتو ئابروو پۆشیو مافی ئافرەتی پێیە:

((الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ بِمَا فَضَّلَ اللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ))[٣].

---

1- الانعام: ١٥١-١٥٣.

2- المائدة: ٢.

3- النساء: ٣٣.

واتە: (پیاو دەبێت هەردەم وەکو یاریدەدەر (الأسناد) یارمەتی ئافرەت بدات –جا چ هاوسەری بێت یا دایكو خوشكو كچی–، وە وشەی –قوام– واتە راستی بكاتەوەو هەڵەكانی بۆ روون بكاتەوەو هاوكاری بكات لە هەورازو نشێوی ژیان وەكو چۆن دووگێی كەپر بۆ داری مێو دەبێتە –قوام– وشەكە لەبنچینەدا لەوشەی (قام) واتە هەستاندا هاتووە –ئا بەم شێوەیەش پیاوان یاریدەدەری راستەوخۆی ئافرەتان بن وە ئەم بڕیارەش لەلایەن خوای گەورەوەیە وەهەروەها ئەم بەرز بوونەوەی یەكێك لەسەر یەكێك لەلایەن خوای گەورەوەیە كە ئافرەتی داناوە وە بەم شێوەیەو پیاویشی بانگ كردووە بۆ یارمەتی بەم شێوەیە تاوەكو پتر خاڵی پەیوەندیان توندو پتەوتر بێتو هەریەكە هەست بەوە بكات كە تەواوكەری ئەوی ترە).

بەڵێ محمد(ﷺ) پەیامی داهێنانو پێشكەوتنی پێیە:

((قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُوا الأَلْبَابِ))[1].

محمد دەستی دز دەبرێت، محمد داوێن پیس سزادەدات، دژی چەوسانەوەو تاوانە، قەلاچۆی نەزانینو دواكەوتنو نادروستی دەكات، هاورێگای دادو یەكسانیو گوێلەیەكتری گرتنە، لەگەڵ پەروەردەو نەرمی داهێنانە، لەگەڵ لێبووردنو تەبایيو برایەتییە، لەگەڵ هەژارو كرێكارو چەوساوەكانە، ...، چۆن ئەم بەهابەرزو رێكانە، چۆن ئەم بنەما پتەوو نەلەرزانە، چۆن ئەم پەیامە پڕ لەزانستو ژیریەی بنچینەی دروست بوونو پاراستنی داوای رەوای كۆمەڵ بەراورد دەكرێتو

---

1– الزمر: ٩.

دەخرێتە بەرامبەر جیهانی توانەوەی ئافرەتو ئارەق خواردنو تۆقاندنو دزیو تاوانو گەندەڵیو نەزانیو شەروار پیسیو...؟! (ﷻ)

((وَمَا يَسْتَوِي الأَعْمَى وَالْبَصِيرُ (١٩) وَلاَ الظُّلُمَاتُ وَلاَ النُّورُ (٢٠) وَلاَ الظِّلُّ وَلاَ الْحَرُورُ (٢١) وَمَا يَسْتَوِي الأَحْيَاءُ وَلاَ الأَمْوَاتُ إِنَّ اللَّهَ يُسْمِعُ مَنْ يَشَاءُ وَمَا أَنْتَ بِمُسْمِعٍ مَنْ فِي الْقُبُورِ (٢٢) إِنْ أَنْتَ إِلاَّ نَذِيرٌ))[1].

پێغەمبەرمان دەفەرمووێت: (ئەگەر درکێك –شوکە وما دونها– یا لە درکێکیش بچووك تر، لاشەی ئادەمیزادی خواناس ئازار بدات ئەوە ئازارو خەمەکەی لەدڵی منە!).

ئا ئەوەیە دلی محمدی پێشەوا(ﷺ)، ئائەوەیە ئازارەکانی دڵی پێغەمبەرەکەت!

* * * * *

محمد(ﷺ) بەهۆی پەیامە بێ وێنەکەی توانی لەماوەیەکی چاوەنوار نەکراو، توانی لەناو نەتەوەیەکی دوور لەبنەمای پێشکەوتن، لەناو جیهانێکی پڕ لەخوێنو توانەوەو تۆقاندن، رەگی گەورەترین دەوڵەتو فراوانترین شارستانی دروست بکات.

تاوەکو ئیمڕۆ نە لە پانیو درێژایی مێژووی بەر لەهاتنی محمد(ﷺ)و نە لەدوای هاتنی محمد نەماندیتو دڵنیاش بە کە نابینین سەردارێکی لەم شێوەیە، رابەرێکی ئەم گۆرانو رامانە کە بتوانێت لەماوەی کەمتر لە ٣٠ ساڵدا لەناو پانترین ناوچەی نیوە دوورگەی عربی ئاڵای ئایینی ئیسلام بەرز بکاتەوە، ئاسۆی ئەم ئایینە بە کەمتر لە

---

1- الفاطر: ١٩–٢٣.

١٢٠ ساڵ كێوەكانی (كوردستانو فارابو كشميرو رباطو غرناطةو مرمره)ی گرتەوە، تيشكی زێرينی ئەم ئايينە زێرينەبوو كە توانی بە كەمتر لە ١٥٠ ساڵ وەكو قوتابخانەيەكی بێ سنوور پانترين گۆرەپانی كيشوەری ئاسياو ئەفريقياو ئەوروپا بكاتە پۆلی مزگەوتەكانو خوێندن وەكو خواپەرستی بڵاو بكاتەوەو ئادەميزادی ئەم ناوچانە لەباوەشی دادو زانستو يەكسانیو ئاسايیش بنوێنێت؟!

بەڵێ پەلەمەكە محمدی خۆشەويستت(ﷺ)بوو كە توانی رەگی شارستانييەتێك لەدڵی زەمين بباتە خوارەوە كە لەسەدەی (ئەنتەرنێتو عولمەو لێك كردنەوەی ناووك) نەتواندرا هاوتای هەبێتو وە دڵنياش بە كە سۆبەسۆ ناتواندرێت.

* * * * *

هەر بۆيە ژيران، هەر بۆيە دامەزراوو خۆگرو هۆگرو هۆزانان، خۆشەويستی ئەم محمدەيان(ﷺ) بەشێوەيەك لەبيردا جێگير بوو بەر لەزمان، خۆشەويستی محمد بەشێوەيەك سەرخانی داگير كردووە بەر لە هەموو شتێك، كە دوای پتر لە ١٤٠٠ ساڵ كە پتر لە ٤٠٠٠ كم شاری هەولێر لەشاری (مكة والمدينة) دوورە كەچی تەنيا لەنێوان ساڵێنی ١٤٢٢ك-١٤٣٢ك ئەوەندە موسڵمانە لێهاتوەی كە چوونە ماڵی خوای گەورەو سەردانی شاری مكەو مدينەی رەنگينيان كرد، لە ١٤٠٠ ساڵی رابردوو لەدانيشتوانی ئەم شارە دێرينەی قەلا (القلعة)و منارە، ئەوەندە خواناسە سەردانی ماڵی خوای گەورەو شاری خۆشەويستيان نەكردبوو (سبحان الله)!؟

* * * * *

هەر لەچەقی شاری هەولێر كە بەكۆنترين شاری جيهان ناسراوە، بەلام (الحمدلله) نوێترين شاری خۆشەويستانی محمدە(ﷺ)، دڵنيابە ئێستا لەسەدەی پازدەی كۆچی (١٤٣٢ك) كە پتر لە ٥٦ نووسينگەی تێدايە تەنيا بۆ رێكخستنو

گواستنەوەی خۆشەویستانی خۆشەویست (الحج والعمرة) بۆ (ماڵی خوای گەورە)و سەردانی ئارامگای خۆشەویستی خۆشەویستان.

تابچن لەماڵی خوای گەورە وەڵامی پێغەمبەرمان ابراهیم(ﷺ) بدەنەوە:

((وَأَذِّنْ فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالاً وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِنْ كُلِّ فَجٍ عَمِيقٍ))[1].

تاوەکو پێیان لەشوێنی پێی بلال و صهیب و سلمان و یاسر و زیدو...،(رضي الله عنهم) بنێن‌و بەبێباوەران بڵێن:

((مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلاً مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا))[2].

خۆشەویستی ئەم محمدە(ﷺ) بەشێوەیەك لەبیردا جێگیرە بەر لەزمان، خۆشەویستی محمد بەشێوەیەك سەرخانی داگیر کردووە بەر لە هەموو شتێك کە دوای پتر لە ١٤٠٠ ساڵ کە پتر لە ٤٠٠٠ کم شاری هەولێر لەشاری (مکة والمدینة) دوورە کەچی تەنیا لەنێوان ساڵ‌نی ١٤٠٠ك-١٤٣٢ك ئەوەندە نووسینەی بەزمانی کوردی شیرین کە لەبارەی واتای قورئانی پیرۆزو واتای فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ)و لەبارەی مێژووی ژیانی پێغەمبەرو یارانی وتاریان فەرموو و نووسینیان بڵاوکردەوە، لە ١٤٠٠ ساڵی رابردوو، ئەوەندە نووسین‌و وتارە پێشکەش نەکراوە!؟

* * * * *

---

1- الحج: ٢٧.

2- الفتح: ٢٩.

خۆشەویستی ئەم محمده دوای پتر لە ١٤٠٠ ساڵ کەچی تەنیا لەنێوان ساڵێنی ١٣٥٠ک-١٤٣٢ک ئەوەندە ئایەتەی قورئانی پیرۆز لەبەر کراوەو شیکراوەتەوەو راڤەکراوە، ئەوەندەی زانستەکانی قورئانی پیرۆز بڵاو کراوەتەوە، ئەوەندە زانا ئایینەی لەم شارەو دەوروبەری بڕوانامەی زانستی ئایینیان وەرگرتووەو ئەوەندەی گرنگی بە دروست کردن و نۆژەنکردنەوەی مزگەوتەکان دراوە، لە ٣٠٠ ساڵی رابردوو ئەوەندە لە گەشە نەبووە لەجیهانی ئیسلام! ؟

ئەم راستییە بەڵگە نەویستانەنە، ئەم زەمینە بتەوانەنە، کە هەردەم نامەیەکی کراوەن بۆ ئەوانەی دەیانەوێت وتە وت بکەن و لەتاریکی بەرد بهاوێن و لەناو گۆمی لێل و شلەقاو خۆیان دەربخەن گوایە: ئایینی ئیسلام بەنووکی شمشێر بڵاوبۆتەوە!

ئیسلام ئەگەر بە ئارەزوو و بیرو ویست بڵاو نەبۆتەوە لەکوردستانی گەورە، ئا ئەوە مێژووی ١٤٠٠ ساڵەی رابردووی کورد، ئا ئەوە راپەڕین و خەباتی کورد لە ١٤٠٠ ساڵی رابردوو، ئایا لەدژی ئایینی ئیسلام هیچ جۆرە دیاردەیەك هەبووە؟

ئایا کورد لەتەمەنە زێرینەکەی کە ١٤٠٠ ساڵی رابردووە لەباوەشی قورئانی پیرۆز، رۆژێ لەڕۆژان بەرهەڵستی ئایینی ئیسلامی کردووە؟ یاخود بەپێچەوانەوە کوردەکەم هەر هەموو شۆڕشەکانی رزگاریخوازی لەمزگەوت ئالای هەلکردووەو ئایینی ئیسلام و بەس بۆتە چەغماغەی شۆڕشەکانی سەربازی و رامیاری و رۆشنبیری و شارستانی.

* * * * *

یەکێك لە لایەنەکانی ژیری کورد بەلای منەوە لەوەدایە کە ووشە رۆنانە، سەیرکە لە بەرامبەر واتای وشەی (محمد یان النبی یان الرسول) وشەی پێغەمبەری داناوە، کە وشەکە خۆی لە خۆیدا پڕ لەواتایە، ئەگەر نیاز لە(پەیغام

بەر)ە یاخود (پیّ غەم بەر)ە، هەردوو لامان گەرەکەو مایەی شانازییە، ئەگەر وشەکە پەیغام بەرەو فارسیە ئەوە واتای (الرسول)ەو هەڵگری پەیامە خۆ ئەگەر (پیّ غەم بەر)ە ئەوە هەر ناسکەو هاتنی ئەم رابەرە لادانی هەر هەموو قەیران‌و گیروگرفت‌و غەم‌و پەژارەیەکی ئادەمیزادە.

ئەوەی کە بەڵگە نەویستە، ئەگەر هۆنەر هۆنراوەیەك بۆ سەردارێك بنووسێت، یا ئەگەر وتارێك بۆ سەرۆكێك بخوێندرێتەوەو باسی بکات بەچاکە، ئەگەر نووسین‌و سروود بۆ سەردارێك دابرێژرێت، ئەوە ئەو سەردارو سەرۆکە بەهۆی ئەم هۆنراوەو وێژەو تابلۆ هونەری‌و نمایشی هونەری‌و پیا هەڵدانە بەرز دەبێتەوە لەلای ئەوانەی کە پێی (مُعَجب)ن، بەڵام کاتیّ کە هۆنەر هۆنراوە بەسەر پێغەمبەردا(ﷺ) هەڵدەرێت، کاتیّ نووسەر نووسین لەبارەی چاکی‌و رێکی پێغەمبەر دەنووسێت، کاتیّ هونەرمەند بە فلچە زێرینەکەی تابلۆی ئایەتانە دەکێشێت کە لەبارەی پێغەمبەرە یا ئەو هۆنراوانە دەنەخشێنێت‌و هێلکاری دەکات کە لەبارەی پێغەمبەرمان نووسراوە، ئەم هۆنراوەو نووسین‌و تابلۆو شانۆو سروودانە نابنە مایەی ئەوەی کە پلەی پێغەمبەرمان بەرز بکەنەوە بەقەد ئەوەی کە پلەی هۆنەرو هونەرمەندو وتاربێژەکە بەرز دەبێتەوە، ئەوەش تاکە رازێکی پێغەمبەرمانە، چونکە خوای گەورە خۆی پێغەمبەرمانی(ﷺ) بەرز نرخاندووەو بەرز کردۆتەوە! ((وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ))(1).

* * * * *

---

1- الشرح: ٤.

من نازانم چۆن خواناسـان دەتـوانن لـەبارەی خۆشەویستەکەیان بـدوێن، ئـەو خۆشەویستەی کە توانی گەورەترینو زۆر ترین خزمـەتی ئـادەمیزاد بکـات بـەهۆی ئەم ئایینە پاك و رێکە کە بڵاوی کردەوە، هیچم نایەتە یاد جگـە لـەوە نـەبێت کـە هۆنــەری نــاوداری کــورد: (مــلا محــوی)(رضي الله عنه) لوتکــە کــە لــە (قــصیدە نــور) دەفەرمووێت: لەهۆنراوەکانی وێژەی زمانی کوردی لەم هۆنراوەیە بەواتاترو بـەهێز ترم نەدیت کە لەبارەی ئایینمان نووسراوە، لەوانەیـە پـتر لـە ٢٠٠ لاپـەڕەم لەسـەر نووسیوە (ان شاء الله) لەدوای ماوەیەکی کەم چاپی دەکەم!

**بەیانی گەورەیی خولقی کەسێ ئایەت لە شائنی بێ**

**نەمەقدوری من و تۆیە نە نیشی (قس)و (سحبان)ە**[1]

* * * * *

وەکو ئاشـکرایە، نـەك لـەم ١٤٠٠ سـاڵەی رابـردوو کـە هـیچ کـەس نییـە بەقـەد محمـدی خۆشەویـست(ﷺ) باسـی کرابێـت بـە چـاکە بـەڵکو دڵنیابـە کـە هـیچ کەسێکیش نییـە لەپـشتی (بابـە ادم)ی پێغەمبـەرمان(ﷺ) تـاوەکو ئیمـڕۆ بەقـەد محمد بەچاکە باسی کرابێت وەهەروەها باسیشی بکرێت (ان شاء الله)!

سەیری لایەنێکی تر بکە، ئەو کاتەی کە ناوەکەی دەبینم کە وشەی محمدە واتە: (ئەو کەسەی کە خـەڵکان باسـی چـاکەی دەکـەن)، وشـەکە وەرگیراوە لەوشـەی (حمد) وە جیوازی لەنێوان (الشکر والحمد) ئەوەیە، وشەی (الشکر) بەرامبەر چاکەیە کە لەگەڵت کراوە بەڵام وشەی (الحمد) بەبێ بەرامبەر باسی چاکەی دەکرێت[2].

---

1- دیوانی: محوی، چ: ١، بغداد: ٤٢٢.

2- بروانە: الفروق اللغویة، ابي هلال الحسن بن عبد الله سهل العسکري (- ٤٠٠ك)، هە: محمد باسل، ط: ٤، مط دار الکتب العلمیة، بیروت، ٢٠٠٦ز: ٦٠.

هەر بۆیە هۆنراوەی (البردە المدیح) کە لەنووسینی (شرف الدین محمد البصیری مصری)یە(ﷺ)، وە تاوەکو ئیمرۆ بە رێك ترین هۆنراوە داندراوە لەسەر پێغەمبەرمان(ﷺ) بۆیە گەلی کورد توانیویەتی لە نزیکەوە هەست بەناسکی ئەم هۆنراوەیە بکاتو جێی پێی خۆیو جێی پێنووسەکەی بکاتەوەو ئەم هۆنراوەیە پتر لە ١٠ جار وەربگێرێتە سەر زمانی کوردی چ بە هۆنراوە چ بەنووسین، هەر لە پێشەوە نووسەرو هۆنەرانی کورد (ملاصفوت، ملا حسین سعدی، ملا میوان ئاکۆیی، ملا رشاد مفتی، ملا شفیع)(ﷺ)، کە لەتیپی پێشەوەنە ئەم هۆنراوەیان کردووە بەزمانی کوردیو چاپیشیان کردووە.

(ملا محوی)(ﷺ) دەفەرمووێت:

**بە ذکر و فیکری شیمەی موصطفە وەقتت موصەفاکە**

**کە باسی ئەو صەفا بەخشە طە رەب خێزە، دور ئەفشانە**[1]

* * * * *

---

فروق اللغات، نور الدين الجزائري، هە: رضوان الداية، دمشق، ١٩٨٩ز: ١١٦، التعريفات، علي محمد الجرجاني، بيروت، ١٩٧٨ز: ٩٨، ١٣٨، عمدة الحفاظ في تفسير اشرف الالفاظ، للسمين الحلبي، هە: محمد باسل، بيروت، دار الكتب العلمية، ١٩٩٦ز: حمد، شكر، المفردات ألفاظ القران، الراغب الاصفهاني، هە: صفوان داودي، دار القلم، بيروت، ١٩٩٢: حمد، شكر.

1- دیوانی: محوی: ٤٢٦.

# تابلۆی دووەم

# تەنیا شوێن کەوتوانت خۆشەویستی خوای گەورەنە !

گرنگترین شت لە ژیانی ئادەمیزاد ئەوەیە کە بتوانێت خۆی بدۆزێتەوە، من لەم گۆشەیەدا باسی ئەوە ناکەم کە جێی پێی خۆی بکاتەوەو جێی پێی خۆی ببینێتەوەو توانای خۆی بەڕوونی بخوێنێتەوە، بەڵکو لەم گۆشەیەدا تەنیا دەمانەوێت ئادەمیزاد بزانێت چ ئامێرێکی لەناو لاشەیە؟

چۆن دەژی؟

بە چ دەژی؟...

بتوانێت توانای خۆی بدۆزێتەوەو سنوور بۆ پێویستییەکانیشی دابنێت.

بەهیچ شێوەیەك ئادەمیزاد ناتوانێت خۆی بدۆزێتەوە تاوەکو نەگەڕێتە بۆ وەڵامی دەیان پرسیار، هەر لەپێشەوە:

کەی دروست کراوە؟

بۆ دروست کراوە؟

کێ دروستی کردووە؟

لە کێ دروستی کرد؟

لە چ دروست کراوە؟...

ئەم شێوەیەش گەرانە بەدوای بیری ئادەمیزاد، یا گەرانی بیری ئادەمیزادە بەدوای سەرەداوە ونەکانو سەرەداوە ئالۆزەکان، کە بزانێت بیری ئادەمیزاد پتر لە (٥٠٠٠ ٠٠٠) ساڵە کەوتۆتە بیر کردنەوەو کارکردن بۆ دۆزینەوەی سنووری ئەو

تواناو دەسەلاّتەی کە دروستی کردووە، دلنیابە، تاوەکو پیتی ئەم وشەیەش دەنووسم، تاوەکو وشەی ئەم رستەیەش دەنووسم، ئادەمیزاد بەرێوەیە لەم بوارەو نەشیتوانیوە بگاتە هیچ سەرەداوێك بەرێکی تەنیا لەژێر سێبەری ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزو نامەکانی ئاسمانی نەبێتو تەنیا لەکەلەنی فەرموودەکانی پێغەمبەرامانو پێغەمبەران نەبێت(ﷺ)!

بەڵێ من باسی گەرانم کرد بەدوای خودی خۆی، با بۆ کاتێکی تربێت بابەتی چۆنیەتی دابین کردنی پێویستییەکانی ئادەمیزاد دوای لەدایك بوونی!

ئا بەم شێوەیە کە هیچ بابەتێك نییە لەخوای گەورەت نزیك بکاتەوە تەنیا ئایینی خوای گەورە نەبێتو بەس یا ئەو بیرە رۆشنو پاکە نەبێت ئەگەر تۆزو گەردی دەوروبەری ژینگە لێلو بیرۆکە دۆراوو رماوەکان کاریان تێ نەکردبێت!

((أَفَمَنْ يَعْلَمُ أَنَّمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ الْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَى إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُوا الأَلْبَابِ))[1].

پێشەوامان دەفەرموێت:

(کل مولود یولد علی الفطرة فابوان یهودان او ینصران او یمجسان)[2]

واتە: هەر کۆرپەیەکی لەدایك دەبێت ئەوە خاوەن باوەڕەو بروای تەواوی هەیە، پاشان دەوروبەرەکەی، بەتایبەتی داكو باوکی دەیکەنە جوولەکەو دیانو ئاگرپەرست).

1- الرعد: ١٩.

2- بروانە: البخاري ومسلم، متفق علیە.

بۆیە زانینی ئایین هیچ سوودی نییە ئەگەر نەگەڕێیەوە لای نامەکانی ئاسمانی نەگۆڕدراوو دەست کاری نەکراو:

((أَفَتَطْمَعُونَ أَنْ يُؤْمِنُوا لَكُمْ وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِنْ بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ))[1].

دوانامەی خوای گەورە کە قورئانی پیرۆزە هیچ سوودی لێوەرناگیرێت تاوەکو نەیخوێنییەوە، خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزیش سوودی نییە تاوەکو تێی نەگەیت، لە تێگەینی قورئانی پیرۆزیش گرنگتر ئەوەیە کە کار بەفەرمانەکانی بکەی، لەکارکردن بەفەرمانی قورئانی پیرۆزیش بەسوودتر لەوەدایە کە کارەکانمان بە دڵسۆزی (الاخلاص) رابپەڕێنین.

دڵسۆزیش لەکار کردن بە قورئانی پیرۆز سوودی نییە ئەگەر بەردەوامی لەگەڵ نەبێت، بەردەوامیش سوودی (البركه) نییەو دروست نابێت لەکار کردن بە دڵسۆزی ئەگەر خۆشەویستی راستەقینەی لەگەڵ نەبێت.

خۆشەویستی دروست نابێت تاوەکو زانیاریت بە بابەتەکە نەبێت.

وە دەبێ بزانی تاوەکو زانیارییەکەشت قووڵترو فراوانترو چڕتر بێت ئەوە خۆشەویستییەکەت بێ سنوورو گەشەدارتر دەبێتو دڵسۆزیشت بەردەوامی لەکارەکاندا رەنگ دەداتەوەو دەنگ دەداتەوە.

((كَذَلِكَ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ))[2].

---

1- البقرة: ٧٥.

2- الفاطر: ٢٨.

خوای گەورە بەزەیی بە (امامی غزالی)دا بێتەوە (رضي الله عنه)و تاوانەکانی بسرێتەوە کە دەفەرمووێت:

(هلك الناس الا العالمون و هلك العالمون الا العاملون وهلك العاملون الا المخلصون وان المخلصين على خطر عظيم)(1).

واتە: ئادەمیزاد لەناوچوون تەنیا زاناکانیان نەبن، زاناکانیش لەناوچوون تەنیا ئەوانە نەبن کە کار دەکەن بەزانستەکەیان، کارکەرەکانیش بەزانستەکەیان لەناوچوون تەنیا دڵسۆزەکانیان نەبن، دڵسۆزەکانیش لە تاقیکردنەوەو گێروگرفتێکی ترسناك دانە. (الله)

((وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ وَيَخَافُونَ سُوءَ الْحِسَابِ))(2).

روونە، ئەوەندەی کە بەراستی لەخوای گەورە دەترسن ئەوە زاناو ژیرەکانن، زاناکان دەزانن بەرزیو گەورەییو توانای خوای گەورە چۆنەو ئەوان بەهۆی ئەم زانیاریانەیان لەتوانای خوای گەورە، ئەوە لێی دەترسنو دەزانن چ سزاو پاداشتێکی پڕ لە دادو یەکسانی هەیە.

((قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ(٣١) قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ الْكَافِرِينَ))(3).

واتای بە کوردی:

---

1- بروانە: امامی غزالی محمد محمد محمد حامد، کە چەند جار لەنووسینەکانی باسی کردووە وە لەفەرموودەی زاناکانی شوێن کەوتوو (التابعين) دەچێت.

2- الرعد: ٢١.

3- آل عمران: ٣١-٣٢.

کاتێ خاچ پەرستانی ناوچەی (نجرانی/ حجان) هاتنەلای پێغەمبەر(ﷺ)و گفتوگۆیان کرد، خوای گەورە پێیانی راگەیاند:

(قُلْ): واتە بە شێوەی فەرمان ، وەهەروەها فەرمانەکەش لەسەرەوە بۆ ژێرەوە، واتە هەلسە ئەم پەیمانو بریارەیان پێ رابگەینە ئەی محمدی پێشەوا.

(إِنْ كُنْتُمْ): ئەگەر ئێوە، هەر هەمووتان.

(تُحِبُّونَ): خۆشتان دەوێت، دیارە خۆشەویستییان بەزمان راگەیاندوە، دیارە دەیانەوێت ئەم ووشەیە بکەنە سەرەتای دلسۆزییان بۆ ئەم ئایینە.

(تُحِبُّونَ اللَّهَ): گوایە خوای گەورەتان خۆش دەوێت، واتە: پێیان بلێ ئەگەر هەموویان دەلێن خوای گەورەمان خۆش دەوێت.

(فَاتَّبِعُونِي): ئەی محمد بفەرموو: وەرن شوێن کەوتووی من بکەون.

(يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ): ئەگەر ئێوە شوێن کەوتوی محمد کەوتن، ئەوە خوای گەورە ئێوەی خۆش دەوێت.

(وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ): تاوانەکانیشتان دادەپۆشێتو دەسرێتەوە.

(وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ): هەر خوای گەورەیە کەوا لێبوردەو بەزەییە.

(قُلْ): دووبارە هەر لەهەمان بابەت بەشێوەی فەرمان: پێیان بلێ ئەی محمدی پێشەوا.

(أَطِيعُوا اللَّهَ) گوێرایەلو راپەرێنەری فەرمانی خوای گەورە بن.

(وَالرَّسُولَ) وەهەروەها لەدوای فەرمانی خوای گەورە گوێرایەلو راپەرێنەری فەرمانی پێغەمبەربن(ﷺ).

(فَإِنْ تَوَلَّوْا) ئەگەر ئێوە سەرپێچی ئەم فەرمانانەی خوای گەورەو پێغەمبەرمان بکەن.

(فَإِنَّ اللَّهَ) بزانن کەوا خوای گەورە.

(لاَ يُحِبُّ الْكَافِرِينَ) بە هیچ شێوەیەك بێباوەڕی خۆشناوێت.

* * * * *

جارێکی تر بە ووردی سەیری ئایەتەکە بکە:

((قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمْ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ (٣١) قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ الْكَافِرِينَ))

لەسەرەتادا بەشێوەی (الأمر) بابەتەکە دەخاتەڕوو، وە بەزەمینەی گفتوگۆیەکی ژیرو نەرم دەفەرموێت: ئەگەر ئێوە، وەکو خۆتان دەڵێن، خوای گەورەتان خۆش دەوێت، واتە پەیرەوی یاسای خوای گەورە دەکەن، چونکە خۆشەویستی خۆ قەپێلكو رووی گەشی بێ ناوەرۆك نییە، وەرن شوێن پێغەمبەر(ﷺ) بکەون، لەم رستەیەدا چیت دێتە بیر؟

(فَاتَّبِعُونِي)، سەیرکە، یەکەم: پیتی (الفاو) کە بۆ (العطف للتعقيب) دێت، واتە یەکسەرو لەدوای یەكو بەبێ ماوە، دووەم: (اتبع) واتە وەرن یەکسەر شوێن پێغەمبەر(ﷺ) بکەوت، وەکو فەرمان (الأمر)، چیت دێتە بیر لەگەل وشەی (اتبع) شوێن کەوتن؟

واتە ئادەمیزاد هەر هەموو کەوتۆتە کاروانی ژیان، واتە چەندان رێگای لەپێشە، وە چەندان کەس هەیە ئەو مافە بەخۆی دەدات کە شوێنی بکەون بۆ گەیین بە شادی ژیانو گەڕانەوەی کامەرانی بۆ ئادەمیزاد، بەڵام ئا ئەوە خوای گەورەیە، ئا ئەوە فەرمانە، ئا ئەوە چەقی قورئانی پیرۆزە، داوا دەکات: وەرن شوێنکەوتووی محمد(ﷺ) بکەون، بەڵێ تەنیا شوێنکەوتووی محمدو بەس(ﷺ)، هەرهەمووتان

((فَاتَّبِعُونِي))، محمد خۆی بانگمان دەکات بەلام بەفەرمانی خوای گەورەیە ئەم بانگ کردنە.

سێیەم: دەبێ لێهاتوو و ژیران بتوانن لە هەورازو نشێوی ژیان، بەراورد نێوان ئەو رێبازە پاکە بکەن کە محمد بۆی کردونە دیاری لەگەل ئەو رۆژە رەشەی کە بێباوەران بۆ ئادەمیزادیان هێناوە، لەروخان و توانەوەی بنەماکانی کۆمەلایەتیو ئابووریو رامیاریو کارگێری.

دیارە هاوکێشەکە بەم شێوەیە دەست پێدەکات، (قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي).

بەلام لەدوای ئەوەی کە خەلکان توانیان ببنە شوێنکەوتوی محمد(ﷺ)، وەکو خوای گەورە بڕیاریداوە کە رابپەرێنن، بەلام لەدوای ئەوەی کە بڕیارەکە راپەرێندراو بونە شوێنکەوتووی محمد(ﷺ)، ئەوە چاوەنوار بووین کە وەکو لەسەرەتای ئایەتەکە بۆمانی خستۆتە روو: ((قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي))، ئێمە بەپێی ئەو بۆچوونە کورتو لاوازو کزەی هەمانە چاوەنوار بووین کە خوای گەورە بیفەرموویایە: (تحبون الله) ئەوە خواتان خۆش دەوێت، واتە خۆشەویستی خوای گەورەتان جێبەجێ کرد کە دوای پێغەمبەرمان کەوتن! چونکە سەرەتایەکە بەدیار خستنی خۆشەویستی خوای گەورە دەستی پێکردووە، بەلام ئەوە بەزەیی خوای گەورەیەو ئەوە زانیاری خوای گەورەیە، ئەم هاوکێشە بەشێوەیەك تەواو دەکات کە لە هەر هەموو شێوەکانی بۆچوونی ئادەمیزادو لەهەر هەموو بۆچوونی زانایانی پشتی پێغەمبەرمان (ادم) (ﷺ)و فریشتەکانو لەمەچێترەکان وردترو بە واتاترە، خوای گەورە نافەرموێت: ئەگەر ئێوە خوای گەورەتان خۆش دەوێت ئەوە شوێنکەوتوی محمد بن دیارە خواتان خۆش دەوێت، بەلکو هاوکێشەکە

ئاوەژوو دەکاتەوەو دەفەرمووێت: ((يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ)) واتە ئەگەر ئێوە دەڵێن: خوای گەورەمان خۆش دەوێت ئەوە شوێنکەووتی محمد بکەون وە ئەگەر واتان کرد ئەوە خوای گەورە ئێوەی خۆش دەوێت لەبەرامبەر ئەوەی کە خوای گەورەتان خۆش بووێت چونکە ئێوە بونە شوێنکەوتووی محمد(ﷺ)، سبحان الله.

بەڵێ ئا ئەوەیە پلەی محمد (ﷺ) لەلایەن خوای گەورە، سبحان الله.

ئا ئەوەیە بەرهەمی شوێنکەوتنی محمد (ﷺ)، سبحان الله، ئا ئەمەیە واتای خۆشەویستنی خوای گەورە، سەیرکە خوای گەورە چۆن خۆشەویستی خۆی بەستۆتەوە بەشوێنکەوتنی محمد، واتە کاتێك دەلێی: من خوای گەورەم خۆش دەوێت، خوای گەورە داوات لێدەکات کە پێت بنێیە جێی پێی محمد (ﷺ)، شوێنکەوتەی ئەو بیت، ئەگەر تۆ بویە شوێنکەوتی محمد، خوای گەورە خۆی تۆی خۆشدەوێت لەجیاتی ئەوەی کە تۆ خوای گەورەت خۆش بوێت.

پاشان خوای گەورە لە دوای ئەوەی کە دەفەرمووێت: من خۆشم دەوێت بابەتێکی (فایلێکی) تری بۆ کردەوە و قۆناغێکی تری خستەروو: (وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ): تاوانەکانیشی دادەپۆشمو رەش دەکەمەوە، بەڵکو ئەو بابەتی دووەمە بەلای منەوە سەرەتای خۆشەویستی خوای گەورە بۆ ئادەمیزاد، کە داپۆشینی تاوانەکانیەتی، لەکۆتایی ئایەتەکەدا خوای گەورە دوو ناوی جوانی خۆی دەخاتە بەرچاو کە لەگەڵ ناوەرۆکی ئایەتەکەدا تێك دەکەنەوە، بەڵێ لەکۆتایی ئایەتەکەدا خوای گەورە (الفاصله) دەفەرمووێت: (وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ).

* * * * *

مافی خۆتە کە بپرسی: بۆچی لەکۆتایی ئایەتەکەدا، ئەم دوو ناوە جوانە مێناوە (وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ)؟

وەهەروەها بشزانە کە خوای گەورە تاوانەکانتان دادەپۆشێتو بەزەییە.

بۆ ئەم دوو ناوە جوانە (غفور، رحیم)و بەس؟

چونکە هەموو بابەتەکان بانگ کردنی بێباوەرانە بەتایبەتی خاچ پەرستانی (نجران)، وە کاتێك ئەوانە گەرانەوە سەر رێبازی راستی ژیان ئەوە پێویستییان بە نامەیەك هەیە کە بیانگاتێ بۆ ئەوەی بزانن کە رابردووە رەشەکەیان رەش کراوەتەوەو داهاتووشیان بەرەو باوەشی جیهانی بەزەیی‌و چاکەیە.

* * * * *

سەیری ئایەتی دوای ئەم ئایەتە بکە چۆن تەواو کەری یەکترن:

لەدوای ئەوەی کە خوای گەورە خۆشەویستی خۆی بەستەوە بە شوێنکەوتنی محمد (ﷺ)، دەفەرمووێت:

(قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ) ئەی محمد پێیان رابگەینە: فەرمانی خوای گەورە جێبەجێ بکەن وە فەرمانی محمد جێبەجێ بکەن، لەدوای یەکترو بەبێ وەستان، ئەم پلە بەرزە بێ هاوتایە گەورەترین ریزە کە خوای گەورە لە محمدی ناوە، وە لەدوای ئەم پلە بەرزە ترسێك دەخاتە دڵو هەورازێك دەخاتە بیر، کە راستەوخۆ هەرکێ لەشوێنکەوتنی محمد دوابکەوێتو هەرکێ فەرمانی محمد(ﷺ) دوابخات ئەوە بێباوەڕە!؟:

((فَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ الْكَافِرِينَ))

واتە: ئەگەر یەکێك، سەیری پیتی (الفاء) بکە چۆن بۆ یەکسەر (للتعقیب) بێ دواکەوتن دێت، هەر کەسێك پشتی لە شوێنکەوتنی محمد کرد، ئەوە خوای گەورە بە بێباوەری داناوەو خوای گەورەش بێباوەری خۆش ناوێت، واتە ئەگەر لە ئایەتی پێشپەوە خوای گەورە دەفەرمووێت:

واتە: خوای گەورە بە راستەوخۆ دەفەرموویێت: ئەوانەی کە شوێنکەوتووی محمدن (ﷺ) من خۆشم دەوێن، وەهەروەها لەم ئایەتەدا بۆمان دوولا بۆوە کە ئەوەی پشت لە پێغەمبەرمان بکات ئەوە خوای گەورە خۆشی ناوێتو تاوانکارە، ئائەمەیە پلەی خۆشەویستی خۆشەویستانت ئەی خوشکو برای موسلمان.

* * * * *

# تابلۆی سێیەم

# قورئان و زانست بەڵگەی پاكیتە!

ئەگەر بەوردی سەیری واتای ئەم سێ ئایەتە بكەین، لەنزیكەوە دەبینین كە خوای گەورە بە چ شێوەیەك پەیامی پێغەمبەرمانی(ﷺ) خستۆتەڕوو و لە چ هێزێكی پتەوی بەستۆتەوە:

((وَالْقُرْآنِ الْحَكِيمِ (٢) إِنَّكَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ (٣) عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ))[1].

سەیركە:

سوێند بە قورئانی پیرۆز كە نامەیەكە پڕە لە زانست و زانیاری و ژیری، لەدوای ئەوەی كە خوای گەورە سوێند دەخوات بە قورئانی پیرۆز، سوێند خواردنیش شێوەیەكی گفتوگۆیە، وەكو ئاگادارم بەكار دێت بۆ دوو شت:

١- ئەگەر بەرامبەرەكەت تاوانێكت بخاتە پاڵ و تۆش بتەوێت پاكی خۆت بخەیەڕوو ئەوە سوێند دەخۆی بەو شتە گرنگانەی كە مایەی گرنگینە.

٢- بەكار دێت بۆ خستنەڕووی ئەو شتانەی كە گرنگن بەرامبەرەكەت ئاگادار دەكەیەوە لەم گرنگیەی كە لەوانەیە ئاگاداری پلەو ریزو نرخەكەی نییە.

كەواتە چ لە حاڵی یەكەم كە لادانی تاوانە لەسەر كەسی یەكەم، چ لەحاڵی دووەم كە خستنەڕووی ئەو شتەیە كە لێی بێ ئاگاینە، ئەوە دەبێ بزانین بۆ خوای گەورە هەیە، سوێند بە دروست كراوەكانی خۆی بخوات و وە سوێند بە خۆشی

---

1- یس: ٢-٣.

بخوات، بەڵام بۆ موسڵمانان نارێکە جگە لە خوای گەورە سوێند بە هیچ شتێکی تر بخوات!

سوێندی خوای گەورە بە دروست کراوەکانی، وەکو:

((وَالْعَادِيَاتِ ضَبْحًا))[1]، ((وَالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ))[2]، ((لَعَمْرُكَ))[3].... بۆ سەرنج راکێشان‌و هۆشیار کردنەوەی ئادەمیزادە لە نرخ‌و پلەی سوێند پێ خوراوەکە.

جارێکی تر سەیری ئایەتەکە بکە: (وَالْقُرْآنِ الْحَكِيمِ)، سەیرکە وشەی (الحکیم) بۆ گیانلەبەر بەکار دێت، وە وشەی (ذات الحکمة) بۆ بێگیان بەکار دێت، بەڵام خوای گەورە ئەم قورئانە پیرۆزەی بەشێوەیەك داناوە کە بەراستەوخۆ پێمان دەڵێت، چۆن ئەندامی هەر گیانلەبەرێك ئەگەر نەمێنێت جا بەچ شێوەو هۆیەك بێت ئەوە دەبێتە مایەی بەربوونی خوێن‌و توانەوەی ئا بەم شێوەیەش قورئانی پیرۆز، ئەگەر هەر پیت‌و وشەیەکی لابدرێت، واتاکەی نامێنێت‌و لەپلەی اعجاز کە گیانی قورئانی پیرۆزە دادەبەزێت!؟

چونکە قورئانی پیرۆز بە هەردوو پێك هاتەکەی: (داڕشتن‌و واتا)ی اعجازە!

لادانی هەر سەرو بۆرو ژێرو چوکلە (الفتحة والضمة والكسرة والشدة)و پیتێك رازی (السر) واتاو داڕشتنەکەی قورئانی پیرۆز ئاوەژوو دەکات، بۆیە خوای گەورە بە (الحکیم)ی داناوە کە لە پلەیەکی زۆر بەرزەو شێوەیەکی رەوانبێژییە، وە وشەی (حکیم کێشەکەی فعیل)ە.

---

1- العاديات: ١.

2- التين: ١.

3- الحجر: ٧٢.

(إِنَّكَ لَمِنْ الْمُرْسَلِينَ)، سەیرکە یەکسەر خوای گەورە روو لە پێغەمبەرمان(ﷺ) دەکات (إِنَّكَ)، ئاگاداری کە رۆڵی پیتی گوێگرتن (الكاف) چ توانایەك بەواتاکە دەدات، واتە بە پیتی دووپات بوونەوەو سووربوون لەسەر بابەتەکە (التوكيد) (أن) وە بە رووبەڕوو بوونەوەی پێغەمبەر (ﷺ) !

بەردەوامە خوای گەورە لەگەل پێغەمبەر بۆیە ئەم جارەیان رۆڵی ئایینەکەی دەخاتەڕوو: (عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ) واتە: لەسەر رێبازێکی راست دای، ئا ئەم ئایینی ئیسلامە رێگای راستی ژیانە، ئەگەر زانایانی ئەندازیاری دەفەرموون، لە نێوان دوو خالّدا تەنیا یەك هێلی راست هەیە یا نزیکترین ماوە لەنێوان دوو خالّدا هێلێکی راستە (اقرب المسافة بين النقتطين خط المستقيم)، ئەوە دلّنیابە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: لەنێوان ئادەمیزادو بەختەوەریەکەیدا تەنیا ئایینی ئیسلام هەیەو بەس، خۆ دەیان رێگا لەبەر ئادەمیزادە بۆ گەیشتن (گوایە) بە بەختەوەری‌و شادی‌و ئاسوودەیی:

(( وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلاَ تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ))[1].

((اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا يُخْرِجُهُمْ مِنْ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا أَوْلِيَاؤُهُمْ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُمْ مِنْ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ أُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ))[2].

بەلاّم ئەم کوێرە رێگایانە وەکو لەبەر چاو دیارە، نەك تەنیا هەر مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە، چۆن ئادەمیزادیان لەخشتە برد لەنیوەی رێگا هەورازی (ایدن)و

---

1- الانعام: ١٥٣.

2- البقرة: ٢٥٧.

قـــەیرانی گەنـــدەڵیو نـــشێوی کوشـــتنو کـــوێرەرێی مـــادە سەرۆخـــشکەرەکانو خۆکوشتنو وێرانو سوتانو داگیرکردن.... ئـادەمیزادی تواندەوە، بـەڵکو رۆژانـە خۆمـــان لـــەناو لاپـــەرەکانی مێـــژوودا دەســـووڕێینەوەو خۆمـــان دیـــواری مێـــژوو بەرزدەکەینەوەو خۆمان دەزانین کاروانی ئادەمیزاد لەبەرامبەر ئـەم هـەموو لـەودە چـەكو تەقەمەنیانـەداو لـەناو ئـەم هـەموو قەیرانانـەی کۆمەڵایـەتیو ئـابووریو رامیاریانەدا بەرەو کام هەردێر دەچێتو کام نشێوی ژیان چاوەڕێیانە ! ؟

((ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ لِيُذِيقَهُمْ بَعْضَ الَّذِي عَمِلُوا لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ))[1].

* * * * *

سەیرکە خوای گەورە لەدوای ئەوەی کە سوێندی بە قورئانی پیرۆز خـوارد، بـۆ ئـەوەی کـە ئاگادارمـان بکاتـەوە لـە ریـزو پلـەی محمـد (ﷺ) لـە چ ئاسـتێکە وە راستەوخۆ بۆمان روون دەکاتەوەو دەیخاتەڕوو: ئەگـەر دەتانـەوێت بـزانن پـەیامی محمد (ﷺ) چۆنەو ناوەرۆکەکەی چەند پتەو بەسوودە بگەڕێوە بۆ واتای قورئـانی پیرۆزو دارشتنی قورئانی پـیرۆز، هـەر چـەند وردی قورئـانی پـیرۆز روونـەو بەڵگـە نەویستە ئەوەندەش پەیامی محمد (ﷺ) بەڵگە نەویستو پتەوە.

واتـە: ئـەم قورئانـە پـیرۆزە هەرچـەند پـرە لـەواتا هەرچـەند وردە لایـەنی دارشتنیو هەرچەند ئادەمیزاد وەستاو لە توانا کەوت کە بتوانێت نامەیەکی وەکـو ئەم قورئانە پیرۆزە بهێنن، ئەوە ئەم هەموو ماتە ووزانە بەڵگەیەکی روونـن لەسـەر

---

1- الروم: ٤١.

پەیامی محمد (ﷺ) کە راستەو پێغەمبەری خوای گەورەیە وە گەورەترین دیاری خوای گەورەی بۆ ئادەمیزاد هێناوە کە رێگای راستی ژیانە.

* * * * *

خوای گەورە لە سوورەتێکی تردا دەفەرمووێت:

((وَالْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ (١) مَا أَنْتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ))[1].

واتە: سوێند بە خامە (یا بە پێنووس) دەخۆم، وە سوێند بەو دێرانەش (الخط، السطر) دەخۆم کە پێنووس دەینووسێت، وە لەئایەتی دووەمدا دەفەرمووێت: تۆ ئەی محمد (ﷺ) بەو چاکە و پلەیەی کە بۆم ناردوی کە لەلایەن خوای گەورەوە بۆت هاتووە، واتە ئەو قورئانەی کە بۆم ناردووی نەبۆتە مایەی لێ تێك چوون و سەر لێشێواویت تۆ شێت نەبوویت.

لەبەرامبەر ئەم دوو ئایەتە بوەستەو بیرت بخەکار، هەستت جۆشدە، سەیر کە چۆن خوای گەورە بەشێوەیەکی روون و راستەوخۆ نەك بە خواناسان بەڵکو بەهەموو ئادەمیزاد دەڵێت:

تاوەکو بیر لە زانست و زانیاری بکەنەوە، تاوەکو زانست و زانیاریتان قووڵ و چڕو فراوانتر بێت، تاوەکو بەرهەمی پێنووس بکەوێتە بازاڕی خوێندنەوەی ئادەمیزاد، ئەوە پتر بۆتان دەردەکەوێت کە ئەم پێغەمبەرە (ﷺ) خاوەن نامەیەکی پتەوەو پەیامەکەی دوورە لە ناتەواوی و خۆشی بەهۆی هاتنی ئەم نامەیە دوورە لە نادروستی!؟

---

1- ن: ١-٢.

ئەگەر بەوردی سەیری ئەم ئایەتانە بکەین بۆمان دوولا دەبێتەوە کە چۆن خوای گەورە لەم ئایەتەدا راستەوخۆ پلەی محمد (ﷺ) بەرز دەکاتەوە، راستەوخۆ چۆن پلەی پێغەمبەرمان دەپارێزێت بەتوانای زانستو زانیاری، راستەوخۆ پێمان دەلێت زانستو زانیاری تاکە بەلگەیەکە لەسەر پاکی نامەو پەیامی محمد (ﷺ)!

جارێکی تر وەرەوە سەر ئایەتەکە:

((وَالْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ (١) مَا أَنْتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ)).

سوێند خواردن بە پێنووسو بە دێرەکانی نووسین:

ئەگەر لەچەرخی ئەنتەرنێت (تۆری جالجالۆکەی جیهانی: WWW) و عَولمەو عَلمانیو لێك بوونەوەی ناوكو كۆشكە هەوربرەکانو... هتد، کەسانێك لە هۆنەرو نووسەران سوێند بخوات بە پێنووس یا بە دێرەکانی نووسین ئەوە شیاوەو هەر زۆربەمان بەلامانەوە ساکارەو گونجاوە، بەلام وەرە خوارەوە بە تاریکستانو رۆناکستانی مێژوو، نەك ٥٠٠ سالّ یا ١٠٠٠ سالّ لەمەوبەر بەلکو پتر لە ١٤٠٠ سالّ لەمەوبەر، لەشارێکدا کە هەر هەموو شاری (مکە)ی رەنگین، ٥٠ نووسەری لێنەبووەو لەناوچەیەك کە لە ٢٪ یان نەیانزانیوە چۆن پێنووس بەکار بهێنن، خوای گەرە دەفەرموویێت:

((وَالْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ (١) مَا أَنْتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ)).

لێرەدا بابوەستینو سەیری لایەنێکی تری ئایەتەکە بکەین:

کە سوێند دەخوات نە باسی پێنووسی خواناسان دەکات! نە باسی ئەو (دێر)انەش دەکات کە لەبواری زانستەکانی قورئانو فەرموودەیە! بەلکو

بابەتەکەی بە بەرفراوانی (المطلق) وەرگرتووەو ئاماژەی بۆ هـیچ جۆرە نووسـین‌و زانستێك نەکردووە.

کەواتــە وەکــو لەســێبەری ئایەتەکــە دەردەکــەوێت، خــوای گــەورە پێمــان دەفەرمووێت:

ئا ئەوە بوارەکانی زانستی بەهەموو رەنگەکانیانەوە، ئا ئەوە بەرهـەمی خامـە لەسەرجەم بابەتەکانی زانست‌و وێژەوە، بێنن بیخەنە بـەر بـیرو بیکەنـە چـاویلکەو سەیری ئەم پێشەوایە (ﷺ)و نامەی ئەم پێشەوایەی پێبکەین بزانین لەسەر رێگای راستی ژیانە یا نا؟

((وَالْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ (١) مَا أَنْتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ)) .

* * * * *

بیرت بخەکار، ئاخۆ لەواتای ئایەتی ئەم دوو سورەتانەدا چیت بۆ دەرکەوت؟

((وَالْقُرْآنِ الْحَكِيمِ (٢) إِنَّكَ لَمِنْ الْمُرْسَلِينَ (٣) عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ)).

((وَالْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ (١) مَا أَنْتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ)) .

هەستت بەوە کرد کە خوای گەورە لە ئایەتەکانی ئەم دوو سورەتەدا تـەنیا لـە دوو سەرچاوەدا ویستویەتی پەیامی محمد (ﷺ) بنرخێنێـت، کـە قورئـانی پـیرۆزو زانیاری‌و زانستە.

هەستت بەوە کرد کە خوای گەورە لەم ئایەتانەدا چۆن رووبـەڕووی بێبـاوەڕان دەبێتـەوەو سـوێندیان بـۆ دەخـوات کـە ئـەم محمـدە (ﷺ) لەسـەر راسـتییە وە گەورەترین بەڵگەش لەم راستییەیدا ئەم قورئانە پیرۆزەیـەو ئـەم داهێنانـەی بـیری ئادەمیزادە، تاوەکو ئادەمیزاد لەبوارەکانی زانستی کیمیاو فیزیاو زینـدەوەرزانی‌و مێژوویی‌و جوگرافیـاو یاسایی‌و پزیـشکی‌و دروسـتی‌و کـشتوکاڵی‌و ژمێریـاری‌و...،

تاوەکو موسڵمانانو بێباوەران بەرامبەر واتاو دارشتنی قورئانی پیرۆز بوەستنو لەئایەتەکانی بکۆڵنەوەو توێژینەوەی زانستییانەی لەسەر بکەن، ئەوە بۆیان روون دەبێتەوە کە پێغەمبەرمان (ﷺ) خاوەنی پەیامی ژیانە، خاوەنی راستە رێگای ژیانە، بەڵێ ئایینی ئیسلام، ئایینی ژیانە وە دوورکەوتنەوەش لە پێغەمبەرمانو ئایینی ئیسلام دوورکەوتنەوەیە لەبەرژەوەندی ئادەمیزاد.

* * * * *

هیچم نایەتە یاد تەنیا یاری خۆشەویستمان (ﷺ) (سلمانی فارسی) (رضي الله عنه) نەبێت کاتێ کە تەمەنی ٦٠ ساڵ بوو وە ٦٠ ساڵیش موسڵمان بوو، کاتێ کە هاتە شاری شاران شاری، شاری رووناك كەرەوەی دلان (المدينة المنورة)، لەدوای ئەوەی کە هەواڵی رێکی ئایینی ئیسلامی بیستبوو لە ئاواییو شارەکانی (شام)و زانستی تەواوی وەرگرتبوو لەبارەی ئایینمانو پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ کاروانی (المدينه) کەوتە رێگا بەمەبەستی ئیسلام بوونو دیتنی پێغەمبەری خوای گەورە، وە لەرێگا لەگەل کاروان چییەکان کە هەندێکیان یارانی پێغەمبەرمان بوون، بەدرێژی باسی کەسایەتی پێغەمبەرمانی (ﷺ) بیستبوو و وە پێیان وتبوو کە محمد (ﷺ) ئەو کەسایەتییەیە کەوا:

هەردەم زەردەخەنەی لەسەر لێوەکانە، هەردەم هاورێی هەژارەکانە، هەردەم خەڵکان گوێ لەوتەکانی دەگرن، هەردەم کاتەکانی بۆ رێکخستنی ریزی کۆمەڵو چارەسەری گیروگرفتی کۆمەڵە، کەسانێکە بێ فیزو بێ لافە، لەگەڵ خەڵکە لێکی ناکەیتەوە چ لە بەرگو چ لەشێوەکانی هەڵسوکەوتی ژیان وەکو رۆیشتن بۆ لای نەخۆشو هاتن بۆ مزگەوتو سەردانی هاوبیرانو خواردنو خواردنەوە، ئیتر ئەم هەموو زانیاریانەی لە بیردا کۆببۆوە کە گەیشتە شاری شاران، شاری مدینەی

رەنگین، هەرکە گەیشتە چەقی بازاڕ، رووی لەیەکێك کردوو و فەرمووی تۆ پێغەمبەری خوای گەورەی، یارەکەی پێغەمبەر فەرمووی: نەخێر من ئەو (فلان) یارەم، رووی لە پیاوێکی تر کردوو پێیووت تۆ پێغەمبەری؟ فەرمووی: نەخێر من ئەو یارەم، ئیتر تاگەیشتە پێغەمبەر چەندان یاری پێغەمبەرمانی بە پێغەمبەر (ﷺ) دانابوو!

چونکە نەیپرسیبوو پتر لە ٨ کەسی بە پێغەمبەر دانابوو لەشێوەی گفتوگۆو رووگەشیو جلوبەرگو بێ لافی، بۆیە هۆنەری کورد، (ملا محوی) لوتکە (رضي الله عنه)، ئەم روداوەی لە تەنیا یەك دێردا تواندۆتەوەو هۆنیتەوە بەبۆیەی پیتەکانی تابلۆکەی رازندۆتەوەو دەفەرمووێت:

**لە نوری پێغەمبەرە ئەوەندی منعکس بوو بوون**

**غەریبی تازە هاتوو وەیدەزانی پێغەمبەرستانە**

* * * * *

# یادی لەدایك بوونی پێغەمبەرمان
# ( دروودی خوای گەورە لەسەر گیانی بێت )

( محمـد ) بـوو كـەوا دنیـای سەرانـسەر شـادو گوڵـشەن كـرد
( محمـد ) بـوو كـە ژیـانی تاریكـستانی ڕەوشـەن كـرد
( محمـد ) بـوو كـە بـانگی دا : دادو ئاشـتی برایـەتی
بـوو بـە بوومەلـەرزەی كۆشـكی چەوسـانەوەو شـایەتی
( محمـد ) بـوو كـەوا فـەرمووی : ( مـن مـات ولم یغـزوا )[1]
دەبـێ چـەكی خـەبا تمان بـێ خـەباتی مـوئمینی زینـدوو

( محمـد ) بـوو قـەلای كـوفری لەڕیـشە هێنایـە دەر
بـوو بـە پێـشەوای ڕا پـەڕین دژی كوێلـەو دەربـەدەر
ئیمـڕۆ لـەیادی هـاتنی ئـەم رەحمـەت و ڕابـەرە
دنیـا گەشـاوەو سـەیرانە چـەژنی ژیـرو ڕەنـج دەرە
ئـاگری گـرت شـەوە زەنگـی ڕێبـازی ژیـانی بەشـەر
بـێ كـەس و برسـی بـەتێكرا بـاغی هیـوای هاتـە بـەر

---

1- فەرموودە: بڕوانە: (مَن مات ولم يغزوا ولم يحدث نفسه لغزو مات على شعبة من نفاق) رواه مسلم.

پانـــایی مێــژوو شـــاهیدە ســـەردەمی ئـــەم رەحمەتـــە
ژێـــرو زانـــاو لێهـــاتوو تـــاجی شـــادی کـــردە ســـەر

بێـــژە پـــیرۆزە لـــە گـــشتی یـــادی رابـــەری ژیـــان
یـــادی ( امـــین ) و ( شـــەورۆیی ) یـــادی هـــاتنی قـــوران[1]
ســـەیری رابردووکـــە : هـــەردەم ئاشـــکرایە ئاشـــکرا
ئیـــسلام نـــەزانی رامـــالی چـــرای زانـــست پـــێ کـــرا

گـــوێگرە چـــۆن بـــە یـــەك ئـــاواز: دانـــاو ژیـــری زەمـــین
دەڵـــێن ( محمـــد ) رەحمەتـــە[2] لـــە بـــۆ گـــشت گۆشـــەی زەمـــین[3]

* * * * *

---

1- الاسراء: واتە شەورۆیی.

2- بروانە ئایەتی: الانبیاء: ١٠٧.

3- نرکەی هۆنراوە، دکتۆر سید بکر بەرزنجی: ٢٢.

# ( شارەدێی بەرزنجە لە روانگەی ملا بێخود )

(مـلا بێخـود)ی[1](ﷺ) هۆنـەری خوانـاس لـەبارەی گونـدی دێـرین و دڵگـیری (بەرزنجە) دەفەرموویت:

**گلـــی یاقووتـــە تـــۆزی عەنبـــەری ســـارایە بەرزنجـــە**
**گیـــای زمرووتـــە بـــەردی گەوهـــەری یەکتایـــە بەرزنجـــە**
**لەلای کوێر گەر بینای وەك دۆزەخـە ئـەمما لـەلای چـاو سـاغ**
**وەکـــو قەصـــر و قوصـــووری ( جنـــە المـــاوی )یـــە بەرزنجـــە**
**مـــەگافی یادگـــاری شێـــری یـــەزدان و( حـــسینین )ە**
**زیـــارەت گـــاهی ئـــالی حـــەضرەتـــی طاهـــا یـــە بەرزنجـــە**
**ئـــەوەك هـــەر کانیـــاوی عـــەینی شـــەهدو شـــیرو تەســـنیمە**
**درەختیـــشی لـــەلای ئـــەربابی خـــۆی گووبایـــە بەرزنجـــە**
**بلـــێ رووی تـــێ نەکـــەن دەجـــال و فیرعـــەونی زەمـــان ( بێخـــود )**
**کـــە جـــەولانگاهی شـــێخ عیـــسا و شـــێخ مووســـایە بەرزنجـــە**

* * * * *

1- بروانـە: دیـوانی بێخـود، کۆکردنـەوەی (محمـدی مـلا کـریم)، بغـداد، چـاپخانە: سـلمان الاعظمـی، ١٩٧٠ز، ٧٩.

ئەمەش تەنیا چەند دێڕێکە لە دیوانی (صابری ) (ﷺ) لوتکی تەسەوف:

**عالــەمی کــردە جــسد نــوری حبیبــی کــردە روح**

**بۆیە وا هــەرماوە نــاخنکیٚ بەســەد تۆفــانی نــوح**

**خوا بە قورئانی موبینی افضالی ئەو ئـەکا اثبـات**

**کافیــە شــق القمــر میعــراج و بــاقی مــوعجزات**(1)

وە لە هونراوەیەکی تردا دەفەرموویٚت:-

- **چــاوی بــازی تــا بخــوێنی ئایــەتی (ایــن المفــر)**

**جان و دل بیٚ فەرر ئـەبن وەك کـۆتری بـیٚ بـال و پـەرر**

**خــۆت ئــەزانی بەندەیــەکم بــیٚ گونــاهو دەســەلات**

**یەعنی چی چـاوو بـروت دائـم لەگـەل مـن دێنـە شـەر**

**تــا بــە نــووری حوســنی تــۆ روناکــە ئــەرز و ئاســمان**

**هــەروەکو تۆفــان ئــەما فــەرقی مــەیانی بــەحر و بــەرر**

**تــۆ لــە ســورەی زولزلــە تــیٚ فکــرە ئــازارم مــەدە**

**خەیر و شەرر ئیفشا ئەبیٚ سوچـم نیـە میـسقالە زەرر**(2)

* * * * *

---

1- دیوانی صابری (کەرکوك/ گوندی شۆرجە ١٨٨١- کەرکوك/ گوندی شۆرجە ١٩٤٤ ز) چاپی یەکەم، کەرکوك چاپخانەی شارەوانی، کۆکردنەوەی شێخ ستار عبدالله بەرزنجەیی ١٩٦٩ز/ ١٣٨٨ك/ ٢٦٦٩کو: ٣٢.

2- دیوانی صابری: ٧٧.

خەلیفەو بنەماڵەی شێخانی بەرزنجەی لەدیدی شێخ رەزا (رضا)ی تالەبانی(رضي الله عنه):

شێخ رەزای هۆنەری ناودار کە بەناوبانگە بەهۆنراوەی داشۆرین (الهجوء) هەردەم شاناز بووە بەبنەماڵەی شێخ معروفی نۆدێو ولیانی (رضي الله عنه)و پیرانی تەریقەتو پیرانی دادو زانستو برایەتی بۆیە ئەم دڵسۆزیەی لەناو چەند دێرێکی ناسکی خنجیلانەدا تواندۆتەوەو توانیویەتی راستەوخۆ سنووری خۆشەویستی خۆی بۆ بنەماڵەی بەرزنجییەکان دیاری بکات:

## ( ستایشی کاك ئەحمدی شێخ )

مەربووتە[1] حەیاتم بە سولە یمانی وو خاکی
خۆزگەم بە سەگی قاپییەکەی ئەحمەدی کاکی
ئەو قودرەتی ساداتە کە سوککانی سەماوات
شەریانە لەسەر سەجدە ئەبەر مەرقەدی پاکی
ئەو مەرقەدی والایە کە وەك عەرشی موعەللا

---

1- هۆنراوەکەم وەکو خۆی نووسیەوە لەبارەی دارشتن، وەکو من بزانم شێخ رەزاو هۆنەرانی سەردەمی ئەو وشەی عەرەبیان هەر بەعربی نووسیوە نەك بە کوردی بەڵام چیم دیت لە دیوانەکە وام نووسیوە !.

مەحفووفە[1] بە زوووواری مەلەك دەوری شوباکی[2]

بۆ دەست و عەسا نازەکەکەی داخە دەروونم

قوربانی عەسای دەستی دەبم سۆل و سیواکی

دنیا لە دووای حەزرەتی شێخ زێر و زەبەر بێ

وەك تاجی کەی و جامی جەم و بەختی زوحاکی

دەرهەق بەحەفیدانی ئەدەب لازمە زینهار

قوربانی حەفیدانی دەبم بابی و داکی

بەم حالە پەرێشانەوە باز ئەشهەدو بیللاهـ

شعرت تەرەب ئەنگێزە رەزا شاعیری چاکی[3]

* * * * *

1- وشەی مەحفووفە واتە محفوف واتە دەوری دراوە، بەڵام شوکر مصطفی بەواتای محفوزی داناوە: ١٢١، ئەمە وانییە.

2- هەرچەندی کردم نەمتوانی دەست کاری ئەو واوە زیادە بکەم کە لە وشەی زوووواری نووسراوە چونکە وەکو خۆی نووسراو بێت باشترە.

3- بڕوانە: دیوانی شێخ رەزا، ساغ کردنەوەی شوکر مصطفی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، بڵاوکراوەی ئاراس، ٢٠٠٠ز، چاپ: یەکەم: ١٢٠-١٢١.

# چەند سەرچاوەیەك لەدوای قورئانی پیرۆزدا :

١- التعريفات، علي محمد الجرجاني، بيروت، ١٩٧٨م.

٢- الجامع الصحيح للإمام محمد بن إسماعيل البخاري، مع شرحه فتح الباري للحافظ ابن حجر العسقلاني، مط: السلفية- القاهرة- ط: ١، ١٣٨٠هـ.

٣- الجامع الصغير من حديث البشير النذير، السيوطي (٨٤٩هـ-٩١١هـ). ط: ١.

٤- الجامع لأحكام القرآن، لأبي عبد الله محمد بن أحمد الأنصاري القرطبي، مط: دار الكتاب العربي لطباعة والنشر، القاهرة، ١٣٨٧هـ-١٩٦٧م ( لەبەر گرتنەوەی چا: دار الكتب).

٥- دلائل الخيرات ابو عبد الله محمد الجزولي، الوسام، ١٩٨٢م، بغداد.

٦- ديوانی بێخود، بغداد، چ:١، ١٩٧٠م.

٧- ديوانی محوی، هە: مامۆستا عبد الكريم مدرس و محمد مامۆستا عبدالكريم، بغداد، چ:١، چا: كۆری زانیاری كورد، ١٣٩٧ك.

٨- الشوقيات، احمد شوقي، چ: ١.

٩- صحيح البخاري، دار المعرفة، بيروت (صحيح البخاري بشرح الكرماني، مصر، مط: البهية، ١٣٥٦هـ).

١٠- عمدة الحفاظ في تفسير اشرف الالفاظ، للسمين الحلبي، هە: محمد باسل، بيروت، دار الكتب العلمية، ١٩٩٦م.

١١- فروق اللغات، نور الدين الجزائري، هە: رضوان الداية، دمشق، ١٩٨٩م.

١٢- الفروق اللغوية، ابي هلال الحسن بن عبدالله سهل العسكري (- ٤٠٠هـ)، هە: محمد باسل، ط: ٤، مط: دار الكتب العلمية، بيروت، ٢٠٠٦م.

١٣- المفردات ألفاظ القران، الراغب الاصفهاني، هە: صفوان داودي، دار القلم، بيروت، ١٩٩٢م.

١٤- نامەیەكی كراوە، سید بكر بەرزنجی، هۆنراوە، دەست نووس.

١٥- نركەی هۆنراوە، سید بكر بەرزنجی، چ: ١، ١٤٢٧ك، هەولێر.

* * * * *

# چالاکییەکانی نووسەر



(سید بکر سید غریبی سێتاقان سید فرج غەزایی بەرزنجی) (هەولێر/ سێتاقان ١٩٥٦ز- )[1]

- لەسالّی ١٩٧٨ز خانەی مامۆستایانی تەواو کردووە.

- لەسالّی ١٩٩١ز بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لەزمانی عربی لەکۆلیجی پەروەردە/ زانکۆی صلاح الدین وەرگرتووە.

- لەسالّی ١٩٩١ز بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لەزمانی عربی لەکۆلیجی پەروەردە/ ابن الرشد/ زانکۆی بغداد دووبارە وەرگرتووە.

- لەسالّی ١٩٩٦ز بڕوانامەی ماستەری لەزانستی قورئانی (موازنة اسلوبية في القران الكريم) لەزانکۆی بغداد وەرگرتووە.

- لەسالّی ١٩٩٩ز بڕوانامەی دکتۆرای لەزانستی قورئانی پیرۆز (كتابة كتب المتشابهات حتى القرن السابع الهجري اهدافها ومناهجها) لەزانکۆی (دولة العربية/ بغداد) وەرگرتووە.

- لەمزگەوتی الاعجاز هەر لە ١٤١١ك، ١٩٩١کو، (تاوەکو ئێستا ١٤٣٢ك) وتاری هەینی پێش کەش دەکات.

- چەندان پیشانگاو کۆری لەبارەی اعجازی قورئانی پیرۆز لەهەولێرو شارەدێکانی دەورووبەری رەوانبێژی پێشکەش کرووە.

* * * * *

---

1- زۆر جار ئەم زانیاریانە بەهەلە بلّاودەکرێتەوە بەتایبەتی لە نووسینەکانی مصطفى نەریمان.

# لەبڵاوکراوەکانی دکتۆر سید بکر بەرزنجی

١- (پێناسەکەم)، هەولێر، چ: ١، چا: شارەوانی، ١٣٩٧ك-١٩٧٧ز.

٢- (لەگەل روانگەی وشەکانم)، چ: ١، هەولێر، ١٤٠٤ك-١٩٨٤ز.

٣- (خۆزگە لەناو لە پتان دەبووم)، چ: ١، هەولێر، ١٤١٠ك-١٩٩٠ز.

٤- (نووستن فێری چیتان دەکات)، چ: ١، هەولێر، ١٤١٣ك-١٩٩٤ز.

٥- (جیهانێکی وون)، چ: ١، هەولێر، ١٣٩٨ك-١٩٧٨ز.

٦- (گەورەترین دەسەڵات) چ: ١،، هەولێر، :١٣٩٩ك-١٩٧٩ز.

٧- (نزیکترین دەرمانخانە)، (زانستی قورئان)،چ:١، چا: الحوادپ، بغداد، ١٤٠٢ك-١٩٨٢ز.

٨- (بەری ئەم لافاوە بگرن) ١ - ٧ بەرگ، چ: ١، هەولێر، ١٤١٣ك-١٩٩٣ز.

٩- (دیاری سەنگەر)، هەولێر، چ: ١، ١٤١٤ك-١٩٩٤ز.

١٠- (موازنة أسلوبية في القران الكريم)- نامەی ماستەر، زانکۆی بغداد، چ:١، ١٤١٧ك-١٩٩٧ز.

١١- (كتب المتشابهات أهدافها ومناهجها الى القرن السابع الهجري)، نامەی دکتۆراه لەزانکۆی دولة عربية (پەیمانگای مێژوو عربی بۆ خوێندنی بالا) لەبغداد، چ:١، ١٤٢٠ك-١٩٩٩ز.

وە هەروەها پرۆژەی وەرگێران و راڤەکردنی قورئانی پیرۆزی دەست پێکرد بەناونیشانی (گیانی ژیان) (روح الحياة) کە لە (١٢٠) بەرگ پێك هاتووە وە تائێستا تەنیا بەرگی:

١٢- (گیانی ژیان) (سورة الفاتحة)، بەشی: ١، هەولێر، ١٤٣٢ك (دەست نووس).

١٢- (گیانی ژیان) (سورة العنكبوت)، بەشی: ٤٢، هەولێر، چا: ماردین، چ: ١، ١٤٢٤ك.

١٢- (گیانی ژیان) (سورة العصر)، بەشی: ١٠٦، هەولێر، چا: الاو، چ:١، ١٤٢٥ك.

١٣- (ئێوە دەڵێن چی)، هەولێر، چ: ١، ١٤١٣ك-١٩٩٣ز.

١٤- (أسرار الحروف في القران الكريم)، (زانستی قورئان)، چ: ١، چا: زانکۆی صلاح الدین، هەولێر، ١٤٢٠ك.

١٥- (نرکەی هۆنراوە)، چ: ١، هەولێر، ٢٠٠٤ز.

١٦- (پانترین تۆر)، هەولێر، چ: ١، ٢٠٠٠ز.

١٧- (ژروه السنام الجهاد)، هەولێر، چ: ١، ١٤٢٣ك.

١٨- (الاسلام و الكورد)، هەولێر، چ: ١، ١٤٢٦ك-٢٠٠٦ز-٢٧٠٥كو.

١٩- (شێخ حسنی گلەزەردە)، نووسینی: شێخ ستار، هەڵسەنگاندن و رێکخستنی: دکتۆر سید بکر هەولێر، چ: ١، ١٤٢ك-٢٠٠٧ز-٢٧٠٧كو.

٢٠- (شێخ محی الدینی کەرکوك)، نووسینی: شێخ ستار، هەلسەنگاندن و رێکخستنی: دکتۆر سید بکر هەولێر، ١٤٢٨ چ: ١، ك /٢٠٠٧ز-٢٧٠٧ کو.

٢١- وەڵامی کورد (١-٤) کە پتر لە ٢٠٠٠ لاپەڕەی گەورە، چ: ١، هەولێر، ٢٧٠٧کو-١٤٢٨ك-٢٠٠٧ز.

٢١- وەڵامی کورد ١-٢٠ ، بیروت چا: عالم المعرفة چ:٢، ١٤٣٢ك.

٢١- شێخ اسماعیلی ولیانی، هەولێر، چ: ١، ٢٧٠٧کو-١٤٢٨ك-٢٠٠٧ز.

٢٢- نامەیەکی کراوە، هۆنراوە (دەست نووس).

٢٣- تاماوەت ماوە تۆ لێی دوور کەوە، چ: ١، هەولێر، ١٤٣١ك.

٢٤- ئاسۆی صەلاوات و بێ ئاگاکان، هەولێر، چ :١، ١٤٣٠ك.

٢٤- ئاسۆی صەلاوات و بێ ئاگاکان، هەولێر، چ: ٢، ١٤٣٢ك.

٢٥- خۆشەویستی خۆشەویستان، هەولێر، چ: ١، چا: هێڤی، ١٤٢٨ك-٢٧٠٧کو- تیراژ: ١٥٠٠ دانە، هەولێر.

٢٥- خۆشەویستی خۆشەویستان، هەولێر، چ: ٢، چا، ١٤٣٣ك-٢٧١٠کو- تیراژ: ١٠٠٠ دانە، هەولێر.

پتر لە ١٣ دەست نووسی ترم هەیە.

* * * * *

# بۆ ئاگاداری:

پـتر لـە شـەش سـاڵە خـەریکی دانـانی ببلیۆگرافیایـەکی بەرهـەمو ژیـانی نووسـەرانی کـوردین بەناونیشانی (الموسوعة وەلامی کورد) نووسـیوەو چـاپی یەکـەم (چـوار بـەرگ، هـەولێر، ١٤٣٠ك)و دووەمان (بیست بـەرگ، بـیروت، ١٤٣٢ك) بڵاوکردۆتـەوە، کـە لـەماوەی ١٤٠٠ سـاڵی رابـردو ژیـاون لەکوردستانی گەورە وە تائێستا پتر لە ٣٥٠٠ کەسایەتی نووسەرو هۆنەرو سیاسەتمەدارو رووناکبیرو هۆنەرو... هتد نووسـیوە وە پـتر لـە ٧٠٠٠ پـەرتووکی دەسـت نـووسو چـاپکراومان نووسـیوە بـە پێنووسی کورد بە چ زمانێك بێتو لە چ شوێنێك بێتو لەسـەر چ بابـەتێك بێـت گـرنگ زادەی بـیری کورد بێتو بەرهەمی بیرۆکەی کورد بێت (نامەکانی خوێندنی باڵاش لەم نووسینانەن) بۆیـە داوا لـە سەرجەم نووسەرو شاعیرو کوردێکی دڵسۆز دەکـەین کـە یارمـەتیمان بـدەن بـە رەوانـەکردنی هـەر زانیاریەك هەیە لەسەر نووسەرو ناودارانی کورد جا چ کۆچیان کردبێت یا لە ژیـان مـابن وە واچـاکە زانیاریەکەش ئەم خاڵانەی تیابێت:-

١- ناوو نازناوی نووسەر.

٢- مێژووی بوونو کۆچ کردنی ئەگەر نەمابوو.

٣- کورتەیەك لەژیانی و وێنەکەی ئەگەر هەبوو.

٤- ناوی بەرهەمەکانی چاپ کراو و چاپ نەکراو و بـزر بـوو و وە شـوێنی بەرهەمـەکانی ئەگـەر دەست نووس بوو چ دەزگا یا پەرتووکخانەی ماڵ.

٥- ژمارەی لاپەرەکانی دەست نووس و جۆری بابەتەکە.

داواکارین لەسەر ناونیشانی دیاری کراو بۆمان رەوان بکەن، خوای گەورە پاداشـتی چـاکەکاران دەداتەوە (ان شاء الله)

لە کۆتاییدا هیوادارم ئەم نووسینە سوود بەخش بێت.

هیوادارم بێبەشمان نەکەن لە تێبینی و سەرنجتان.

(ان شاء الله) لە چاپی سێیەم سەرجەم بۆچوون و تێبینیەکانتان دەخەینەروو و داواکارین خوای گەورەش پاداشتی چاکەتان بداتەوە چونکە نیازی گشتمان خزمەتی ئەم گەل و ئەم زمانە شیرینە.

* * * * *

# هەڵسەنگاندن

## بەناوی خوا گەورە

## السلام عليكم ورحمه الله و بركاته

کاتێ سەیری پەرتووکی (خۆشەویستی خۆشەویستان)م کرد چاپی یەکەم، بەچاکم زانی کە ئەم نامەیە بنووسمو تێبینیەکانمی تێدا دیاری بکەم بۆ سید بکر: وە پتر لە ٢٠ ساڵە نووسینە ئایینییەکان دەخوێنمەوە وە پتر لە ٢٠ ساڵیشە سید بکر دەناسم وەکو نووسەرو هۆنەر وە هۆنراوەو وتارەکانم بیستبوو.

بۆیە دەمەوێت ئەم ملاحەزانەی بۆ بنووسم بۆ سوودو بەس نەك نقدو رقەبەری:

ناوی پەرتووکەکەم بەلاوە زۆر جوان بوو بەڕاستی ناوەکەی سەرنج راکێشەر بوو.

نازانم –نیازم چاپی یەکەمە– بۆ ئەوەندە هەڵەی چاپخانە تێدابوو بەتایبەتی هەموو هەڵەکان لەلایەنی نووسینی عربیو کوردی کۆمپیۆتەر بوو و بۆ پێشی چاپ چارەنەکرابوو دەتواندرا بەماوەیەکی زۆر کەم ئەم هەڵەی هونەریانە روونەدات.

ئەو کیتابە لەکاتێکی باش کەوتە بازاڕ بەتایبەتی لەو کاتەبوو کە لەدەوڵەتەکانی دانیمارکو ئەلمانیا لەدژایەتی پێغەمبەرمان(ﷺ) دەکرێتو شتی خراپ بڵاو ببۆوە.

پەرتووکی بچووك پڕ واتا زۆر گرنگە بەتایبەتی لەو کاتە ئەم پەرتووکەش بەڕاستی چەند بچووکە بەڵام پڕ واتایە.

من زۆر سەیری تەفسیرەکانی سید بکر دەکەم نازانم لۆ ئیشارە بۆ مصدر ناکات وا بزانم هەر بە بۆچوونی خۆی ئەم تەفسیرانە دەکات ئەوەش خراپ نییە بەلاّم جاری واهەیە شتی نویّ دەلّیّ من سەرسامم لە بۆچوونەکانی سید بکر.

خۆزگە کاك سید ئەم نووسینانەی بەزمانی عربی دەنووسی یا بکرابایە ترجمە چونکە من زۆر جار کە پەرتووکە بچووکەکانی زمانی عربی دەخوێنمەوە دەبینم زانیاری تێدایە بەلاّم بەڕاستی ئەم پەرتووکانەی کوردی بەگشتیو سید بەتایبەتی، شتی نوێی تێدایە، قەیدی چییە ئەگەر ئێمەش شتی ئایینی بکەینە عربی یا زمانی تر تاوەکو بزانن کوردیش لە مەبەستی ئیسلام گەیشتییەو کوردیش خۆی توانای شیکردنەوەی هەیە.

لەکۆتاییدا هیوادارم سید بکر سوود لە تێبینیو قسەکانم وەرگرتبیتو بیر لە نووسین بەزمانی عربی یا وەرگێران بۆ زمانی عربی بکاتەوە.

**برات**

**ئاکار بەختیار عبداللە سورچی**

**ئەندازیار هەولێر**

* * * * *

# پێرس



| ز | بابەت | لاپەڕە |
|---|---|---|
| ١ | پێشەکی دووەم ................................ | ٥ |
| ٢ | پێشەکی یەکەم ................................ | ٦ |
| ٣ | تابلۆی یەکەم: مەبەست لە خوا پەرستن ................................ | ١٠ |
| ٤ | تابلۆی دووەم: تەنیا شوێن کەوتوانت خۆشەویستی خوای گەورەنە ! ...... | ٣٢ |
| ٥ | تابلۆی سێیەم: قورئان و زانست بەلگەی پاکیتە! ................................ | ٤٢ |
| ٦ | چەند سەرچاوەیەك لەدوای قورئانی پیرۆزدا ................................ | ٥٧ |
| ٧ | چالاکییەکانی نووسەر ................................ | ٥٨ |
| ٨ | لەبلاوکراوەکانی دکتۆر سید بکر بەرزنجی ................................ | ٥٩ |
| ٩ | بۆ ئاگاداری ................................ | ٦١ |
| ١٠ | هەلسەنگاندن لەلایەن: ئەندازیار ئاکار بەختیار سورچی ................ | ٦٢ |
| ١١ | پێرس ................................ | ٦٤ |